Zakho Centre for Kurdish Studies



# دیوانا
# مەلا
# نوورەدین
# سندی

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن
د. فاخر حەسەن گولی

# دیوانا

# مـەلا سـنـدی

## مەلا نۆڕەدین مەلا حەسەن بێشیلکی - سندی

۱۹۳۲-۲۰۰۳


ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی



Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بۆ ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكۆلینێن كوردی

| | |
|---|---|
| پەرتووك | دیوانا<br>مـــەلا ســــنـــدی |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤكرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێكێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین<br>بەرگ | دیـــار عـبـداللە<br>جەگەرخوین جەمیل<br>وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-9168-8-0 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٤٨ / ٢١ |



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەكۆلینێن كوردی

zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

# پێشەکی

دەمێ ئەم دیوانێن هەلبەستان دخوینین بۆ مە دەردکەڤیت هندەك ژ ئەوان کارتێکرنا ئایینی و هندەکان یا نەتەوەیی و دلداری ل سەر زاڵبوویە، هەر چەندە خودانێ ئەڤێ دیوانێ (مەلا نۆرەدینێ سندی) وەك ئێك ژ تەخ و چینێن مەلایان دهێتە هژمارتن، لێ دیوانا ئەوی نە ب تنێ هۆزانێن ئایینی ب خوەڤە دگریت، بەلکو پڕە ژ هەلبەستێن مێژوویی، نیشتیمانی، ئەڤینداری و... هتد. ل ڤێرێ دێ هەوڵدەین ب شێوەیەکێ ڕێکوپێك ئاماژە ب گرنگترین خاڵێن گرێدایی ب ژیاننامەیا جڤاکی، ئایینی و سیاسی یا هەلبەستڤانی بکەین، و ژ لایەکێ دیترڤە د چەند ڕێزەکاندا تیبینیێن جهێ مفا وەرگرتنێ ل سەر ئەڤێ دیوانێ بنڤیسین.



### هەڵبەستڤان ژلایێ جڤاکیڤە:

مەلا نۆرەدین مەلا حەسەن خدر، ل ساڵا (١٩٣٢)ێ ل گوندێ (بێشیلك)ێ ژ گوندێن (صوفیان) سەر ب دەڤەرا (سندیان)ڤە ژدایکبوویە، ناڤهاتی ژ بنەماڵەکا ئایینی و جڤاکیێ دەڤەرێ دهێتە هژمارتن. ل ساڵا (١٩٥٤)ێ ژیانا هەڤژینیێ ل گەل خانم (ئسمەر عەبۆ عومەر) پێکهینایە و خودایێ مەزن پێنج کوڕ (عەبدولهادی، موحەممەد مەهدی، محیەدین، لوقمان، سەگڤان) و چار کچ (بەیان، جیهان، ڤیان و شیلان) ب ئەوان بەخشیە، ناڤبری ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٣/١/١٧)ێ ل بازێڕێ زاخۆ ژ ئەڤێ جیهانێ بارکریە.

### قۆناغێن فەقێیاتیا هەلبەستڤانی:

مەلا نۆرەدین د ژیێ شەش ساڵێیدا ل دەڤ بابێ خوە دەست ب خواندنا قورئانا پیرۆز کریە، مفایەکێ باش ژ زانستێ بابێ خوە وەرگرتیە، د ژیێ

دوازده ساڵێیدا ل ساڵا (١٩٤٤)ێ بابێ ئەوی وەغەرا داوییێ کریە، پاشان ژبۆ بەردەوامیدان ب خواندنێ چوویە دەڤ (مەلا ئیبراهیمێ گۆیی) و ل نك کورێ ئەوی (مەلا یووسف)ی دەست ب خواندنێ کریە و پاشی بەرەڤ ئەرمشتێ دەڤەرا سلیڤانەیانڤە چوویە و بۆ ماوێ ساڵەکێ ل نك (مەلا سەعید ئەرمشتی) مژویلی خواندنێ بوویە، پاشان بەرەڤ گوندێ (مارسیسێ) سەر ب دەڤەرا سندیانڤە ب رێ کەڤتیە و بوویە فەقیێ (مەلا تەها دەشتماسەکی) و ژ وانەیێن ئەوی مفادار بوویە، پاشان بەر ب باژێرێ زاخۆڤە چوویە و ل مزگەڤتا مەزنا باژێری ل دەڤ زانایێ ناڤدار (مەلا ئەحمەد عەبدولخالق)ی دەست ب فەقێیاتیێ کریە، پاشان بەرەڤ گوندێ باکرمان ل نێزیك زاخۆ چوویە و بۆ ماوێ ساڵەکێ ل بەر دەستێ (مەلا عەبدولرەحمان مەلا ساڵح)ی خواندیە.

پشتی ساڵەکێ د زڤرێتەڤە زاخۆ و جارەکا دیتر ل دەڤ (مەلا ئەحمەد عەبدولخالق)ی بەردەوامیدایە خواندنا خوە و پاشان وەك بانگ هەلدێرێ مزگەڤتێ (موئەزن) هاتیە دەستنیشانکرن، هەروەسا ل گەل ئەڤی کاری بۆ ماوێ دوو ساڵان نوینەراتیا ئەوقافا زاخۆ کریە، و پاشی بەرەڤ گوندێ (ئێلینجاغ) ل پارێزگەها هەولێریڤە چوویە و ل دەڤ (مەلا موحەممەد بەحرکی) دەست ب فەقێیاتیێ کریە و ژ وێرێ بەرەڤ گوندێ (لەیلان)ڤە چوویە و بۆ ماوێ ساڵەکێ مفا ژ وانەیێن (مەلا عەلی لەیلانی) وەرگرتیە، پاشان دزڤرێتەڤە زاخۆ ژ وێرێ بەرەڤ رۆژئاڤا کوردستانێ چوویە و ل نك (مەلا ئیسماعیل)ی وانەیێن ئایینی خواندینە و پاشان ڤەگەرپایەڤە باژێرێ دهۆکێ و بوویە فەقیێ (مەلا عەبدولهادی موفتی) زانایێ ناڤدارێ ئەوی سەردەمی یێ دهۆکێ.

پاشان ژ دهۆکێ بەرەڤ باژێرێ مویسلڤە چوویە و ماوەیەکی ل خواندنگەها (الاحمدیة) ل دەڤ زانایێ مەزن (بشیر الصقال) وانەیێن ئایینی خواندینە و ئیجازا مەلاتیێ پێهاتیە بەخشین، پاشی ل گەل خێزانا خوە بەرەڤ دەڤەرا شنگالێڤە چوویە و ل گوندێ (ڕەمبۆسی) بنەجهـ و مەلاتیا گوندێ ناڤبری کریە، ژبۆ بەردەوامیدان ب خواندنا ئایینی بەردەوام هاتن و چوونا گوندێ (قابووسیە) کریە و ژ وانەیێن زانایێ ناڤدار (مەلا حسێنێ ماڕونیسی) مفادار بوویە و ئیجازا مەلاتیێ ژلایێ مەلایێ ناڤهاتیڤە پێهاتیەدان، پشتی بوورینا سێ سالان دزڤڕیتەڤە زاخۆ و پشتی ئەنجامدانا تاقیکرنێ، کو ژلایێ زانایێ مەزن (مەلا ئەحمەد عەبدولخالق)یڤە هاتبوو ڕێکخستن شیابوو ئیجازەکا دیتر یا مەلاتیێ وەرگریت.

## ڤۆناغێن مەلاتی و مامۆستایەتیا هەلبەستڤانی:

مەلا نۆڕەدین پشتی چەندین سالان ب مەبەستا بدەستڤەهینانا زانستی ژ ئەڤی ئالی بۆ ئالیێ دیتر و هەوڵ و بزاڤێن ئەوی یێن بەردەوام شیابوو (ئیجازەیا) مەلاتیێ بدەستخوەڤە بهینیت، لەوڕا دەم بۆ دەمێ مەلاتی و مامۆستایەتیێ، هەر ب ئەڤێ مەبەستێ ل سالا (١٩٥٨)ێ ل گوندێ خوە (بێشیلك)ێ ئاکنجیبوویە و دەست ب پێشکێشکرنا وانەیێن فەقەیان کریە و چەندین فەقەهـ هەبووینە ژ ئەوان: (مەلا عوبەید، مەلا معاد، مەلا عەلی کەشانی، مەلا عەبدولعەزیز و...هتد). ل سالا (١٩٦٠)ێ ل باژێڕێ مویسل پشکداری د خۆلەکا پەروەردیی بۆ ماوێ شەش هەیڤاندا کریە.

ل دەستپێکێ مەلا نۆڕەدین وەك مامۆستایێ سەرەتایی ل قوتابخانەیا (نۆڕدینا) پاشان ژبۆ قوتابخانەیا گوندێ (ئاڤگەنی)یێ سەر ب دەڤەرا (سندیان)ڤە هاتیە ڤەگۆهاستن و مژویلی وانە گۆتنی بوویە، لێ ژبەر

پەیوەندیكرنا ئەوی ل سالا (١٩٦١)ێ ب شۆڕەشا ئەیلولێڤە، ڕژیما عیراقێ فەرمانا دویركرنا ئەوی ژ كارێ مامۆستایی دەركریە، بەلێ ل سالا (١٩٦٣)ێ جارەكا دیتر دزڤڕیتەڤە ل سەر كارێ خوەیێ مامۆستایێ ژبۆ دەمێ سالەكێ ل خواندنگەها (دێرەبوون) ل دەڤەرا سلێڤانەیان دەست ب وانە گۆتنێ كریە، و هەروەسا دناڤبەرا سالێن (١٩٦٤-١٩٦٦)ێ دا ل خواندنگەها گوندێ (ئەصدێدا سەرێ) سەر ب دەڤەرا (شرقات)ڤە و دیسان دناڤبەرا سالێن (١٩٦٦-١٩٦٨)ێ ل قوتابخانەیا (ڕمانا) ل دەڤەرا (قیارە) بەردەوام وانە گۆتینە. پاشان بۆ دەڤەرا ئاكرێ، بۆ خواندنگەها (بجیل) هاتیە ڤەگۆهاستن و هەر ل ئەوێ دەڤەرێ ل سالا (١٩٦٩)ێ ل قوتابخانەیا (دینارەتە) مژویلی وانە گۆتنێ بوویە.

دەمێ بەیانامەیا (١١)ێ ئادارا سالا (١٩٧٠)ێ هاتیە ڕاگەهاندن، ناڤبری ل گەل خێزانا خوە زڤڕیتەڤە بازێڕێ زاخۆ و ل قوتابخانەیا (ڕزگاری) دەست ب كارێ مامۆستایێ كریە، هەر د ئەوی دەمیدا وەك ئەندامێ ئێكەتیا زانایێن ئایینی یێن كوردستانێ هاتیە دەستنیشانكرن، پشتی شۆڕەشا ئەیلولێ ل سالا (١٩٧٥)ێ ب داوی هاتی، ژێگۆتی جارەكا دیتر دەست ب كارێ خوە یێ مامۆستایێ كریە و ل قوتابخانەیا (شەرانش)ێ ل دەڤەرا (سندیان) دەست ب وانە گۆتنێ كریە، بۆ ماوێ دوو سالان ل وێرێ مایە و ل سالا (١٩٧٨)ێ بۆ (خواندنگەها ڕزگاری) و پاشی بۆ قوتابخانەیا (هیزل) ل زاخۆ هاتیە ڤەگۆهاستن، ناڤبری بەردەوامی دایە كارێ مامۆستایەتیێ و هەتا سالا (١٩٨٩)ێ ل سەر میلاكێ پەروەردێ هاتیە خانەنشینكرن، لێ ل سالا (١٩٩٣)ێ ل دویف ڕێڤەبەریا ئەوقافا زاخو، وەك خوەبەخش بوویە پێشنڤێژ و گۆتارخوینێ مزگەڤتا (الرحمة) ل زاخۆ و پاشان بۆ مزگەڤتا (الحاج قادر) ل زاخۆ هاتیە ڤەگۆهاستن، هەژی گۆتنێیە هەتا وەغەركرنێ ل سەر ئەركێ خوە ل

مزگەڤتا ناڤبری بەردەوام بوویە، ب دەهان خواندەکار و فێرخوازێن زانستی ل بەردەستی ئەوی فێربووینە و خزمەتا ئەوی یا ڕۆهن و ئاشکرایە.

**هەڵبەستڤان ژلایێ سیاسیڤە:**

هەلبەستڤان ل ساڵا (١٩٥٧)ێ پەیوەندی ب ڕێزێن پارتی دیموکراتی کوردستان- عیراقێڤە کریە، پشتی مەلا مستەفا بارزانی ل ساڵا (١٩٥٨)ێ ژ ئێکەتیا سوڤیەتی زڤڕیەڤە کوردستانێ، (مەلا نۆڕەدین) وەك ئێك ژ ئەندامێن شاندێ زاخۆ ژبۆ پێشەوازیکرنا بارزانی ل بەغداد هاتیە هەلبژارتن و ل گەل بەرپابوونا شۆڕەشا ئەیلولێ و پەیوەندیکرنا هژمارەکا زێدە یا کوردپەروەران ب شۆڕشێڤە، بەشەکێ مەلایان ژی پەیوەندی ب شۆڕەشا ناڤبری کرن و ژبەر زیرەکاتیا ئەوان د خواندن و نڤیسینێدا پتریا ئەوان بوونە کادرێن پێشکەڤتی یێن شۆڕەشی، ناڤبری ل دەستپێکا شۆڕەشا ناڤهاتی ل ساڵا (١٩٦١)ێ پەیوەندی ب شۆڕەشا ناڤبری کریە و ڕۆلەکێ بەرچاڤ گێڕایە و پشکداری د ئازادکرنا باژێڕێ زاخۆ دا کریە، ل ساڵا (١٩٧٤)ێ پشتی ڕەوشا سیاسی دناڤبەرا سەرکردایەتیا کوردستانێ و ڕژیما عیراقێ تێکچوویەڤە، پەیوەندی ب ڕێزێن شۆڕەشێ کریە و ب فەرمانا مەلا مستەفا بارزانی وەك (قازیێ شەرعی) ل ناڤچەرداریا باتیفا دەڤەرا گولیان هاتیە دەستنیشانکرن و هەتا ب داوی هاتنا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٧٥)ێ ل سەر کارێ خوە بەردەوام بوویە.

هەر چەند پشتی شۆڕەشا گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨)ێ سەرهلدای (مەلا نۆڕەدین)ی نەشیایە بگەهیتە دناڤ ڕێزێن شۆڕەشا ناڤبریدا و ببیتە پێشمەرگە، لێ بەردەوام د پەیوەندیێ دابوویە، هەژی گۆتنێیە کوڕێ ئەوی (عەبدولهادی) پشکداری د شۆڕەشا گولانێدا کریە و ل ساڵا (١٩٨٢)ێ (عەبدولهادی) ل گەل دوو ژ کەسوکارێن خوە ب هۆکارێ کەڤتنا ئەوان د بوسەیەکا

لەشكەرێ عیراقێ دا ل نێزیك گوندێ (مەلا عەرەبی) ل دەڤەرا گولیان هەر سێ شەهید بوون، (مەلا نۆرەدین) ب هەمی واتایانڤە كەسەكێ كوردپەروەر و حەزژێكەرێ گەل و وەلاتێ خوە بوویە، هەر كەسێ ب هویری هەلبەستێن ئەوی بخوینیت، ئەڤ چەندە دێ بۆ ئەوی ڕۆهن و ئاشكرا بیت.

**بەرهەمێن هەلبەستڤانی:**

یا دیار (مەلا نۆرەدین)ی هەوڵەكا باش دایە خواندنێ كو چەندین بەرهەمان بنڤیسیت، ب ئەڤێ چەندێ شیایە هژمارەكا پەرتووكان ل پشت خوە بهێلیت و ژبۆ هەمیان ببنە جهێ مفا وەرگرتنێ و ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێ نە:

- (كنز الدرر في معجزات سيد البشر) ب زمانێ عەرەبی د شەش بەرگاندا هاتیە چاپكرن.
- شرح المقصود ابن زيد المسمى (الشرح الوافي والدا الصافي)، ب زمانێ عەرەبیە.
- (رفع نقاب المستعصي عن معاني قصيدة ابن حنان الاندلسي)، ب زمانێ عەرەبیە.
- دیوانا هەلبەستان یا ب ناڤێ (دیوانا مەلا سندی)، ب زمانێ كوردیە.
- (مەولوودناما مەلا سندی) ب هەلبەست، ب زمانێ كوردیە.
- (تاريخ عشيرة السندي والگلي) ب هەر دوو زمانێن عەرەبی و كوردیە.

**چەند تێبینیەك ل سەر ئەڤێ دیوانێ:**

هەر چەند ب كورتی ژی بیت دێ ئاماژە ب ئەوان تیبینی و خالێن گرنگ و بالكێش كەین ئەوێن د ئەڤێ دیوانێدا هاتین كو ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێنە:

- ئەڤ دیوانە ژ هەشت پشکان پێکهاتیە: ئایینی، پەروەردێ، نیشتیمانی، مێژوویی، ئەڤینی، هەمەرەنگ، پشکا شاهێن کوردان بەری ئیسلام و پشکا عەرەبی. هەر ئێك ژ ئەڤان پشکان چەندین هەلبەستان ب خوەڤە دگریت، هندەك پشك کێم و هندەك زێدە. دابەشکرنا ئەڤێ دیوانێ ل سەر چەند پشکان ژ لایێ هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێڤە هاتیە رێکخستن، ب تنێ چەندەك نەبن کو ژلایێ مەڤە هاتینە رێکوپێکرن واتە دەستکاری د پێش و پاشیا هندەك هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێدا هاتیەکرن، مەرەم ژێ پێ ئەو بوویە داکو ب شێوەیەکێ زانستیتر بهێتە سەروبەرکرن.
- مەلا نۆرەدینی ناسناڤێ (سندی) بۆ خوە هەلبژارتیە و د چەندین مالکێن هەلبەستێن خوە دا ب ئاشکرایی ئاماژەپێکریە مینا:

سـنـدی دلسـۆزە  بـۆ کوردسـتانێ
قـەلـەم ل دەسـتـێ  ل ڤـێ مـەیـدانێ

هەر دیسان دبێژیت:

سـندی ل هـەمـی چاخـا
بـۆ کـوردینیێ بزاخـا
دی تـە ئێخـت نـاڤ داخـا
ئـەگـەر تـازە نـە روینـی

- ل دویڤ ئەو ڤەکۆلینا ل سەر هەلبەستێن مەلا نۆرەدینی هاتیەکرن، ئەڤ چەندە دیار دبیت کو رەنگە ناڤبری ل سالا (١٩٦٠ هەتا ١٩٦١)ێ دەست ب ڤەهاندنا هەلبەستان کربیت بۆ نموونە هەلبەستا ب ناڤێ (قوتابخانا نۆردینیا) ئەوا دناڤبەرا سالێن (١٩٦٠-١٩٦١)ێ هاتی نڤیسین وەك کەڤنترین و ئێکەمین هەلبەست بهێتە هژمارتن.
- پرانیا هەلبەستێن ئەڤێ دیوانی مێژوو ل سەر نە هاتینە نڤیسین، ب تنێ کێمەکا ئەوان نەبن بۆ نموونە وەك: هەلبەستا قوتابخانا نۆردینیا (١٩٦٠-

١٩٦١)ێ، قوتابخانا (دێرەبوون (١٩٦٢)ێ، قوتابخانا ئەصديدا سەرى (١٩٦٥)ێ، قوتابخانا خابوور (١٩٧٢-١٩٧٣)ێ.

- هەولٚ هاتيەدان هەر پەيڤەكا نە رۆهن يان پەيڤێن پێدڤى ب پێناسەكرنێ د ديوانێدا، ب شێوەيەكێ رێكوپێك ل پەراوێزان هاتينە نڤيسين.

- ب هيچ رەنگەكى مە دەستكاريا رێنڤيسا هۆزانڤانى نەكريە، ب تنێ د ئەوان پەيڤاندا كو ب شاشيا رێنڤيسى دهێنە هژمارتن و كارتێكرنێ ل ريتم و واتايا هۆزانێ و چارچووڤێ گشتيێ ئەوێ ناكەت، راستڤەكرن هاتينە ئەنجامدان، بۆ نموونە: (چوـ چوو)، (بوـ بوو)، (بوـ بۆ) و... هتد.

- دناڤ هەلبەستێن ئەڤێ ديوانێدا كو پتريا ئەوان ب زمانێ كوردى هاتينە نڤيسين لێ چەند مالك ب زمانێ عەرەبى تێكەلى هەلبەستێن كوردى كرينە مينا:

قلـــــت قـــــولا ثــــم قالـــــت

قـــــم لنـــــــذهب للســـــــرور

قلـــــــــــــت مـــــــــــولاتي

ســــروری علـــى النيشـــان خـــال

واتە: (من گۆتنەك گۆت پاشى وى گۆت، دێ رابە دا بچينە كەيف و خوەشيێ، من گۆت ئەز قوربان، كەيفخوەشى ل سەر من ڤالەيە).

- مەلا نۆرەدينى د پشكا (شاهێن كوردان بەرى ئيسلام)ێ د ديوانێدا شرۆڤەكرنەك ب زمانێ عەرەبى نڤيسيە پاشان پوختەيا وێ ب زمانێ كوردى وەك هەلبەست ڤەهانديە. مە هەولٚدايە تەڤايا ناڤەرۆكێن عەرەبى ئەوێن هەلبەستڤانى ل پەراوێزان هينايين ژبۆ زمانێ كوردى ڤەگۆهێزين و ئەڤێ نڤيسينێ بكاربهينين: ((ژ تيبينيێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ ديوانێ ب زمانێ عەرەبى هاتيە وەرگێران)).

- ئەڤ دیوانە مینا گەلەك دیوانێن دیتر، هندەك هەلبەست دوو یان سێ جاران هاتینە ڤەهاندن، هەر ب ئەڤێ مەبەستێ مە هەوڵدا دانەیەکێ ژ ئەوان وەك هەلبەستا بنەڕەتی ل قەلەم بدەن و ل گەل دانەیێن دیتر بەراورد بکەین و جیاوازییێن ئەوان ل پەراوێزان بنڤیسین، داکو ب ئەڤێ چەندێ پتر ببیتە جهێ مفا وەرگرتنێ.
- پشکا دویماهیێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە بەرهەڤکرن کو ئەو ژی ب تنێ ژ دوو هەلبەستان پێکهاتیە. یا ئێکێ ئایینییە ب ناڤێ (بأسم الله رب الخلائق) و یا دیتر نیشتیمانییە ب ناڤێ (أیا منقذ الأکراد)ە.
- وەسا دیارە کو هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ هەتا ئاستەکی شارەزایی د زمانێ فارسیدا هەبوویە، لەورا هژمارەکا زێدە یا پەیڤێن فارسی بکارهینایە مینا: بیهودە (بێ مفا، بێ قازانج)، گەند (گەنی)، سۆختە (سۆتی)، بەد (نەباش)، ئاتەش (ئاگر)، خەندە (کەنی) و... هتد.
- هەر کەسێ ب هویری ئەڤێ دیوانێ بخوینیت دێ ب دەهان پەیڤێن عەرەبی بینیت، ئەڤ چەندە ژی بۆ کارتێکرنا ئایینی ل سەر هەلبەستڤانی دزڤڕیت، کو کەسەکێ ئایینی بوویە. ل ڤێرێ ب تنێ دێ ئاماژە ب چەند پەیڤان کەین مینا: صاحب طەریق (خودان ڕێباز)، واعظ (بانگخواز)، ظەهر (پشت)، نەظیف (پاقژ)، جور (ستەم)، لحظە (دەم) و... هتد.
- ئەڤ دیوانە وەك گەلەك دیوانێن کلاسیکێن دیتر هژمارەکا زێدە یا پەیڤێن کوردی ب دارشتنا عەرەبی هاتینە نڤیسین وەك: صەد (سەد)، پصمام (پسمام)، طاری (تاری)، قەط (قەت)، هوصا (هوسا)، بسطینن (بستینن)، طرس (ترس) و... هتد.

ل داویێ سوپاسیا خودایێ ئەرد و ئەسمانان دکەین کو هێز و شیان داینە مە ئەم ئەڤێ دیوانێ بگەهینینە ئەڤی ئاستی، هەروەسا سوپاسیەکا

تایبەت بۆ مالباتا هەلبەستڤانی کو ئەم بووینە جهێ باوەریا ئەوان و ل سەر ئەڤێ دیوانێ کار بکەین، نەمازە کوڕێ ئەوی (موحەممەد مەهدی) کو بەردەوام هاریکار و پشتەڤانێ مە بوو. هیڤیدارین ژ یەزدانی ئەڤ کارە ببیتە جهێ مفا وەرگرتنا تەڤایان.

د. فاخر حەسەن گولی

دهۆک ٢٠٢١

# سەر نامەیێ ڤێ دەفتەرێ

سـەر نامـەیـێ ڤـێ دەفتـەرێ
کـو مـن نڤێسـی ڤـێ دەمـی
دیباجـەیـا[١] بنـاڤێ خـودا
یـا ڕەب ژمـە دویرکـێ غـەمـێ

گاڤـا کـو یـەزدانـی ڤیـا
چێکـت ژبـۆ خـو کـەونـەکـی
ئـانی وجـوودێ[٢] وی قـەلـەم
وی ئافـەرانـد ب لـەونـەکـێ[٣]

ئـەووەل[٤] خـودا گۆتـە قـەلـەم
بنڤـێس ل سـەر لـەوحـێ[٥] دەلال
نـاڤێ مـن یـێ زیبـا[٦] و جـان
نـێ هـەر ئـەزم صـاحب جـەلال[٧]

---

(١) پێشەکی، بەراهی.

(٢) هەبوونێ.

(٣) ب ڕەنگەکی، ب شێوەیەکی و...

(٤) ئێکێ.

(٥) د ئایینێ ئیسلامێدا دبێژنێ (لوح المحفوظ) کو ل ئەسمانێ حەفتێیە و ڕویدان و بویەرێن بووری تێدا هاتینە تومارکرن.

(٦) جوان، دەلال و خشکوك.

(٧) خودان سەروەری.

فەربوو ل سەر مە ژ وێ دەمێ
ناڤێ وی یێ عالی[١] و بلند
ل پێشیا هەمی گۆتارێ خۆ
دەینین ئەوی نەقشێ دەلال

ئەو ناڤێ جانیا صەفحەیان[٢]
دانین ل پێش هەر نوسخەیان[٣]
نێ ئەو کلیلا دەرگەیان
ڤەدبن ب وی بۆ مە مەجال

هەر تشتێ ئەم دەست لێ ڤەدین
ناڤێ خودا ل پێشیێ نە دین
وی تشتی دێ بیهوودە[٤] دین
ئەو تشتە نەقص و بێ کەمال

ئەو وەختێ ئادەم چێکری
ل پشتێ بۆ نوورا ئەنوەری[٥]
پاش ژ پشتێ هات سەری
یا ڕۆهنی و جان و زەلال

هاتن تەماشا چار طەڕەف[٦]

---

(١) بلند و سەری.

(٢) بەرپەڕ، تا و لاپەڕ.

(٣) دانەیان.

(٤) (بیهودە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (بێ مفا، بێ قازانج، بێ بەرهەم و...) ددەت.

(٥) ڕۆناهیا خودێ.

(٦) ئالی، ڕەخ و لا.

وەستان ل دۆرێ صەف ب صەف[١]
سوجدە برن وان ڕەف ب ڕەف[٢]
ئەوان مەلائیکێت دەلال

ئەو نوور د پشتا ئادەمی
بوویە ئەصڵ بۆ خاتەمی
بوویە موحەممەد وی دەمی
ل سەر تەختێ ذاتێ ذی الجلال[٣]

ناڤێ وی همبەرییێ خودا
قەط[٤] جارەکێ نابت جودا
د تەحیات و تەشەهودا
بێ وی نڤێژ دێ بت بەطاڵ

هاتە نڤێسین د ئەزەل
ل سەر لەوحی ب ئەمرێ[٥] خودا
ل سەر قصوورێ[٦] جەننەتێ
ئەڤ ناڤێ شرین و دەلال

ئەیا موحەممەد سەروەری
تو دۆستێ شاهێ ئەکبەری[٧]

---

[١] ڕێز ڕێز.
[٢] جوین جوین.
[٣] خودێ سەروەری.
[٤] ل جهەکێ دیتر: قەت.
[٥] ب فەرمان.
[٦] (قصور) واتە گەلەك (قەصر).
[٧] خودایێ مەزن.

ژ پێغــــەمبـــەرا ئـــەفســـــەری[١]

خاتـــەم ل پشـــتی بوویـــە خـــال

ئـــەیـــا خـــودانێ مـــەهـــدەری

ڕۆژا قیامـــــــــەت ڕابـــــــتن

ل نـــــك خـــــودایێ ســـــەروەری

هێڤـــی ژ تـــە پـــەیـــدا بـــتن

هـــەر تـــو شـــەفیعـــێ[٢] ئۆمـــەتـــێ[٣]

نـــێ مـــن ژ تـــە هێڤـــی هـــەیـــە

ســــندی[٤] ل بـــەر تـــە دیـــارتن

نـــێ وی ژ گونـــەهـــا تـــەوبـــەی



---

[١] مەزنی.

[٢] بەرڤان.

[٣] نەتەوە، گەل، مللەت و...

[٤] مەلا نۆرەدین سندی باسێ خوە دکەت کو ناسناڤا وی یێ ئەدەبی (سندی)یە.

# چێكرینێ خودێ

هزار تف بچن چاڤێ شەیطانی
سەرێ هەر تشتی ناڤێ یەزدانی

چ شۆلێ بكین بێ ناڤێ یەزدان
پێ كەیفخۆش دبت ئەو سەگێ شەیطان

خودا پەناهم[1] دائیم ب تویە
پەناهت نەبت بەندە بێ ڕویە

ژبۆ بەندەیان هەر تو هاوكاری
ل هەمی دەرا هەر تو دیاری

شۆلێ تە هەمی پێكڤە غەریبن
چێكرایێ تە هەمی عەجێبن

كەسەك نزانت ب ڕاست چاوانی
بەلێ ل هەر تشتی وێنە عەیانی[2]

عەزمان[3] و عەدر[4] تە ئافەراندن
هەمی زیدەگاه تە لێ جەماندن

مرۆڤ و جن و پر تەخلیت[5] گەلەك
كەسەك نزانیت چەندن ئەو مەلەك[1]

---

(1) هاوار و هیڤی.

(2) دیار و ئاشكرایە.

(3) عەسمان، ئەسمان.

(4) دەڤەرا زاخۆ ل شوینا عەرد پەیڤا (عەدر) ب كار دهینن.

(5) تێكهەل.

هۆلا ڤی عەردی د ڤێ چەرخی دا
هەر[2] دزڤڕت د ڤێ نەرخێ[3] دا

قەط[4] ئەو گۆم[5] نابت د ڤێ گەڕهانێ[6]
یەك جار خوار نابت د ڤێ دەورانێ

بیست و چار[7] ساعەت دەورا ڕۆژێیە
سێ صەد و شێستا دەورا صالێیە

خۆرشید[8] مەه و ئەستێر[9] و ئەفلاك[10]
تە ئافەراندن ب ڤی ڕەنگێ چاك

چیا و خاك و كانی و رووبارا
گول و گیا و هەم دار و بارا

كانێ مەعدەنێ[11] ب هەمی ڕەنگە
دونیا ب ڤانە زۆرا پڕ شەنگە



---

(1) مەلائیكەت - فرشتە.

(2) ل جهەكێ دیتر: هەر یا.

(3) بها.

(4) ل جهەكێ دیتر: قەت.

(5) (گوم) پەیڤەكا فارسی یە ڕامانا (بەرزە- هندا) ددەت.

(6) گەشت- گەڕیان.

(7) ل جهەكی دیتر: چوار.

(8) (خورشید) پەیڤەكا فارسی یە ڕامانا (حەتاف، تاف و ڕۆژ) ددەت.

(9) ستێر.

(10) ئەفلاك (فەلەك) واتە چەرخا گەردۆن.

(11) كانزا.

طـــەیـــر و طـــەوال[١] و هــــەمـــی جانــــەوەر
ل ڤــــێ دونیـــــایێ بــــەلاڤبوون ل ســــــەر

پێکڤـــە دژیـــن هـــەمـــی بـــە ئێمـــیش[٢]
ئـــەوێ شـــۆلکەر و بـــەطـالٚ[٣] و بـــێ ئـــیش[٤]

هـەر یـەك توخمـەکـن ب هـەزارا ئـەو ڕەنـگ
هـــەر یـــەك زمانـــەك ئـــاواز و ب دەنـــگ

گـول چـەنـد تـوخمن[٥] و چـەنـدی ڕەنگـن
ئـەرنـاك و ئـەشـكال وە چـەنـدی شـەنگـن

هـــەر تشـــتێ ل ڤـــێ دونـــێ[٦] ببیـــنم
بـــێ شـــەکـــە[٧] ژ وێ عیبـــرەتـــێ هلیـــنم

چێکریـــێ تـــە تـــم[٨] ژیـــۆ تـــە شاهـــد[٩]
هـەر یـەك ژێ دەلێـت[١٠] خـودا تـو ماجـد[١١]

ڕوو ڕەش ئــەو کــەســن کـۆ تــە نـەناسـن
شــەرمــەنــدە[١] ئــەوەن د بــێ کراســـن[٢]

---

[١] تەیر و تەوال.

[٢] ل گەل مە، ژ زارڤێ سوڕانی هاتیە وەرگرتن.

[٣] بەتالٚ.

[٤] بێ کار، بێ شۆل، ژ زاراڤێ سوڕانی هاتیە وەرگرن.

[٥] جین، جۆر.

[٦] ل جهەکی دیتر: دنێ.

[٧] بێ گومان.

[٨] هەموو، تەڤا.

[٩] دیدەڤان.

[١٠] دبێژیت، ژ زاراڤێ سۆڕانی هاتیە وەرگرتن.

[١١] بەرێز و هێژا.

پۆشمانی[٣] دبن د ڕۆژێ تالی[٤]
پەرتووك و شەهین ئەوا نە خالی

کەسێ گوهدار بت بۆ ئەمرێ خۆدێ
ئەوێ جهـ خۆش بت کا تو گۆهـ بدێ

وی جهـ بەهەشتە ب خێر و خۆشی
ئاڤا کەوثەرێ ئەو دێ ڤەنۆشی[٥]

قەصرِ و پەلاس و بێلا[٦] و ئەیوان
بنگەهـ و باغ و ڕووبار و دیوان

بڕەنگەها مێوە[٧] هنگڤین و شەڕاب[٨]
مسك و عەنبەر و زوباد[٩] و گوڵاب

دلێ تە بچت چی چاڤ بە وی ڕۆهن بوون[١٠]
ولحم طیر مما یشتهون[١١]

---

[١] (شەرمەندە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (شەرمزار) ددەت.

[٢] بێ جلوبەرگن.

[٣] پەشیمانی.

[٤] ڕۆژا دویماهیێ.

[٥] (ڤەنۆشی- وەنوش) ژ پەیڤا فارسی یا (نوشیدن) ڤەخوارن هاتیە.

[٦] ڤیلا.

[٧] فێقی. ژ زارڤێ سورانی هاتیە وەرگرتن.

[٨] ڤەخوارن.

[٩] دۆهنەکێ بێهنخوەش و ڕەنگێ وێ ڕەشە.

[١٠] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (وفیها ما تشتهیه الانفس و تلذ الأعین)، سۆرەتێ (الزخرف)، ئایەتا (٧١).

[١١] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (ولحم طیر مما یشتهون)، سۆرەتێ (الواقعة)، ئایەتا (٢١).

وان حورعەینی ڕووگەش و گول گۆن
ڕەنگێ وان وەکی لۆلۆئێ مەکنون[١]

ل وێ خدمەتکار لاوێن سەرنخۆن
ئەون ویلدانێ هەفر موخەلەدۆن[٢]

تشتێ تە بڤێت نێزیکی تەیە
چنینا مێوە[٣] زۆر ئاسانەیە[٤]

جلوبەرگێ وێ هەمی ئەرمۆشن[٥]
برا دزانێ چەند تازە و خۆشن

هەمی سۆندسن[٦] و ئیستەبرەقن[٧]
نەرم و خۆشکوکن ئەو قەط[٨] نە ڕەقن

خەمل[٩] و چەکێ وێ زێڕ و گەوهەرن
تاجێ ل سەر سەرا هەمی جەوهەرن[١]

---

[١] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (وحور عين كأمثال اللؤلؤ المكنون)، سۆرەتێ (الواقعة)، ئایەتا (٢٣).

[٢] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (يطوف عليهم ولدان مخلدون)، سۆرەتێ (الواقعة)، ئایەتا (١٧).

[٣] فێقی.

[٤] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: ( قطوفها دانية)، سۆرەتێ (الحاقة)، ئایەتا (٢٣).

[٥] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (ولباسهم فيها حرير)، سۆرەتێ (فاطر)، ئایەتا (٣٣).

[٦] سۆندس و ئیستەبرەق ڕامانا (ئاڤرمیش، حەریر) ددەت.

[٧] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (ويلبسون ثيابا خضرا من سندس و استبرق)، سۆرەتێ (فاطر)، ئایەتا (٣١).

[٨] ل جهەکێ دیتر: قەت.

[٩] جوانی، ڕێکوپێکی.

بـــەحســـێ بـــەهشـــتێ ئـــەزێ چـــی بێـــژم
هنـــدی ئـــەز بێـــژم ئـــەز لال و گێـــژم

پـــەســـنێ قورئـــانێ ژبـــۆ وێ کـــری
ئـــەگـــەر مـــەیـــزەکـــێ[٢] دێ هـــەر[٣] گـــری

گونـــەهـــا بـــابێ مـــە ئـــەم ژێ دەرکـــرین
گوهـــدا شـــەیطـــانی وی ئـــەم ژێ بـــرین[٤]

گوهـــ دا حـــەوایـــێ دەیکـــا حیلـــەبـــاز[٥]
دا دەســـتێ وی ســـێڤ گـــۆتێ کـــا بگـــاز[٦]

دەمـــا بـــابێ مـــە ئـــەو ســـێڤ کرکرانـــد[٧]
بـــەرکـــێ بـــەهشـــتێ د بـــەژنـــێ دا فرانـــد[٨]

خـــۆدێ لـــێ خـــۆش بـــت وی پیـــرە بـــابی
ئـــەوی ئـــەم دانـــە دەســـتێ خراپـــی

---

[١] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (یحلون فیها من اساور من ذهب)، سۆرەتێ (الکهف)، ئایەتا (٣١).

[٢] سەحکرن.

[٣] ل جهەکێ دیتر: ژ کەیفا.

[٤] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (وقلنا یا آدم اسکن انت وزوجك الجنة وکلا منها رغدا حیث شئتما ولاتقربا هذه الشجرة فتکونا من الظالمین)، سۆرەتێ (البقرة)، ئایەتا (٣٥).

[٥] فێلباز.

[٦] (گازدان) پەیڤەکا فارسیە و رامانا (لەقدان) ددەت.

[٧] خوار، لەقدا.

[٨] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (فلما ذاقا الشجرة بدت لهما سوآتهما وطفقا یخصفان علیهما من ورق الجنة)، سۆرەتێ (الاعراف)، ئایەتا (٢٢).

دونیا چو نینه هەر بێ تالییە[1]
ئەهلێ دونیایێ ل وێ بێ ڕووییە

قورئانا کەریم ب ڤێ نظامێ[2]
خودا کریە دەستوور ژبوونا عامێ

ما بەر دکەڤت ئەم ڤێ بەدخانێ
ل دوو ببەزین ب دژی قورئانێ

وی حوکم[3] و ئەحکام هەمی بەیانن
هەر وەکی ڕۆژێ هەمی عەیانن[4]

مافێ هەر کەسی تێ مسۆگەرە
ئەهلێ قورئانێ هەر ئەو سەرورەرە[5]

هەمی کەس تێدا وەکی برانە
عەینەن[6] هەر وەکی ددانێ شانە[7]

لێ ما ئەز چبکم مەدەست ژێ بەردا
خاسمە سەرۆکا ڵ هەمی عەردا

---

(۱) بێ دویماهیە، بێ داویە.

(۲) ڕێکخستنێ، سەروبەریێ.

(۳) فەرمان، دەستویر.

(٤) بەرچاڤن، دیارن، و...

(٥) ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (یاایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوبا وقبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم)، سۆرەتێ (الحجرات)، ئایەتا (۱۳).

(٦) وەك، مینا.

(۷) ژ فەرموودەیا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (الناس سواسیة کأسنان المشط لا فرق لعربي علی أعجمي و لا أعجمي علی عربي الا بالتقوی، کلکم من آدم و آدم من تراب).

لەوا ئەم کەتن دەستێ نەیارا
کەسەك ناکتن بۆ مە چو چارا

ئەمێ پیستربین هندی ئەم هووبین[1]
د دەست زۆردارا ئەمێ بێ ڕووبین[2]

سەرسۆڕ نێ ئەزم د حیکمەتێ دا
بێ هۆش و عەقل د ڤێ دنێ دا

ئیلا کو مەگەر هاوکار[3] خودا بت
وە ڕاهبەر[4] بۆ من مصطەفا[5] بت

یا ڕەبێ ب حەقێ مصطەفا کەی
سندی[6] تو ب ڕۆهنیا خوە شا کەی[7]

یەك لەحظە[8] مە نەسپێرە نەفسێ[9]
وێ پیسە سەبەب[10] دووژەه[11] و حەبسێ



---

(1) هۆسا، وەسا.

(2) بێ ڕوومەت.

(3) هەڤکار، هاریکار و...

(4) ڕێبەر، پێشەوا.

(5) مەبەست موحەممەد پێغەمبەرە (س).

(6) مەلا نۆڕەدین خودانێ دیوانێ.

(7) کەیفخوەش کەی.

(8) دەم.

(9) مە ڕادەستی نەفسێ مەکە.

(10) هۆکار، سویچ.

(11) دۆزەخ، جەهنەم.

هــەردەم كــو نــەفــس هــەڤــالێ شــەیطــان
ڕوحـــــە دبیـــــتن هــــەڤـــالێ ڕەحمـــــان

یـــا ڕەب تـــو ڕوحـــم بشــــوو ب جـــارەك
بــێ نــەقصــی[1] ژبــۆ تــە صــەد تــەبــارەك

[1] بێ كێماسی.

## خۆشتڤیترین ل نك یەزدانی[1]

سـەرێ هـەر سـەرا یـەزدانـێ مـەزن
گـەلـێ دونیـایێ ئـەوی چێكـرن

د قورئـانێ دا گـۆ[2] ئـەی گـەلـی ناسـن
هشیار بـن هـوون هـەر ئـەصلـێ خـۆ بناسـن

مـن هـوون چێكـرن ژ دائـو بابـەكـی
هـوون هـەمـی بـەنـده بـۆ خودایـەكـی

هـوون چـەنـد مللـەتـن چـەنـد قـەبـائیلن
هـوون چـەنـد بابـك و عـەشـیر و عـیلن

دا هـەمـی دگـەل ئێـك وەكـی بـرابن
بـۆ شـۆلێ خێـرێ پێكڤـە هـوون ڕابـن

خۆشـتڤیترین ل نـك یـەزدانـی
ئـەو كـەسـە ئـێ تـەقـوایێ بزانـی

---

[1] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (یاایها الناس انا خلقناکم من ذکر وانثی وجعلناکم شعوبا و قبائل لتعارفوا ان اکرمکم عند الله اتقاکم)، سۆرەتێ (الحجرات)، ئایەتا (١٣).

[2] گۆت.

## تو ژ ئادەمی و ئادەم ژ ئاخێ[١]

پێشـــڕەوێ[٢] مـــەزن پـــەیغـــەمبـــەرێ مـــە
ئـــەڤ گۆتنـــا هـــە ژ وی گـــەهشـــتیە مـــە

گـــو ئـــادەمیـــزاد[٣] هـــەمـــی ب تـــەمـــامی
ئاغـــا و گـــەدا[٤] ب خـــاص[٥] و عـــامی[٦]

هـــەمـــی ڕێـــزەکـــن ل نـــك یـــەزدانـــی
عـــەینـــەن هـــەر وەکـــی ددانـــێ شـــانی

زێـــدەهـــی نینـــە هـــەر عـــەرەبـــەکـــی
ل سـەر هـەر کـەسێ یـان عـەجـەمـەکـی

مـــەگـــەر ب تورســـا[٧] یـــەزدانـــێ گـــەورە
ئـێ خـۆدێ نـاس بـت هـەر ئـەو ب فـەخـرە

تـــو ژ ئـــادەمـــی و ئـــادەم ژ ئـــاخێ
دە خـــۆ نـــاس بکـــە ئـــەگـــەر تـــو بزانـــێ

---

[١] ژ فەرموودەیا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (الناس سواسية كأسنان المشط لا فرق لعربي على أعجمي و لا أعجمي على عربي الا بالتقوى، كلكم من آدم و آدم من تراب).

[٢] ڕێبەر، سەروەر و...

[٣] (ئادەمیزاد) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (مرۆڤ) ددەت.

[٤] خوازخوازوك.

[٥] تایبەت.

[٦] گشتی، تەڤایی و...

[٧] ترِسا.

## هەر كەس ئازاد ژدايكبوويە[1]

فـــارۆقێ[2] مـــەزن گۆتنـــەك وی گـــۆت
دلـــــێ زۆردار وڤاڵمــــــا وی صــــــۆت[3]

گـــۆ ئـــادەمیـــزاد بینـــە ب ســـەربـــەســـتی
وە كرنـــە بـــەنـــدەئـــێ خســـتنە دەســـتی

دایكـــا هـــەر كـــەس وەك ئـــەو بـــی یـــە
ئـــەوی ســـەربـــەســـت بـــی بـــەنـــدیی چـــی یـــە

---

(1) ئیمام عومەر دبێژیت: (متى استعبتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا).

(2) ئیمام عومەر كوڕێ خەتابی.

(3) سۆت.

## بەیتا صەد مالکا نونێ، ئەی نۆڕەدین[1]

ئەی نون و واو و ڕائو ئا
وەی لام و دال و یائو نون
ڕابە ژبۆ خۆ کار بکە
بێ شۆل تو ئێدی بەس بڕوون

ڕابە ژخەو هشیار بە
هەردەم گری و زاری بە
بەس تو لبن ڤی باری بە
هاورێ و هاوکار[2] ل تە چوون

یەك یەك ژتە بوونە جودا
موحتاجی بوورینا خودا
کەسکێ چو فایدە ل وان نەدا
هەر وەك ئەوان دۆستەك نەبوون

هەر وەك کەسێ ژار و فەقیر
کەس وان چو جار[3] نا ئێتە بیر
چوون و دیار نابن ل دویر
ژینا ئەوان بیهودە[4] بوون

---

(1) ئێخسیر.

(2) هەڤکاری، هاریکاری.

(3) ل جهەکێ دیتر: جا.

(4) (بیهودە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (بێ مفا، بێ قازانج، بێ بەرهەم و...) ددەت.

ژینـا عــەمــەل[1] دگــەل نــە بــت
ل مرنــێ خــودان پــڕ گــەنـدە[2] بــت
بــێ شــەكــە دێ بــێ چــارە بــت
پــێش بــەر خــودائی ســەرنخــوون

ڤێچـــا دڤێـــت هشـــیار ببـــێ
بــۆ طاعــەتــی تــو ب كــار ببــێ
ل نـــەفســا تـــو نـــەیــار ببــێ
ڤـا[3] پێنچــی ژ عــەمــرێ تــە چــوون

پێنچــی ل تــە بــوورین تــەمــامم
هــەر غــافلێ ئــەی بــێ مــەقــام
بوونـــا دنـــێ تـــو بـــەردەوام
ڤــێ پیــرە پیســا حــەیــزە بــوون

دونیـا گــەلــەك پیــرە و كــەڤــن
لاوێ ب ئاقـــل ژێـــت ڕەڤـــن[4]
هــیچ ئــەو ل دوور وێ نــا جــەڤــن
دزانــن چ پیســە و كــەڤنــە قــوون

دزانـــن چ ئـــەو بـــێ تـــالی یـــە[5]
ژ راســتی و دورســتی خــالی یــە

---

[1] كار و شۆل.
[2] (گەند) پەیڤەكا فارسیە و ڕامانا (گەنی) ددەت.
[3] ئەڤان.
[4] ل جهەكێ دیتر: ژێ د ڕەڤن.
[5] بێ دویماهی، بێ داوی.

بێشـــەكـــە ئـــەو هـــەر فـــانی یـــە[1]

دزانـــن قـــەوی ل پێشـــیا مـــە چـــوون

دزانـــن قـــەوی ژێ چـــوون گـــەلـــەك

جـــان جـــەحێـــل و چـــاڤ بـــەلـــەك

پێكڤـــە د گـــورێ بـــوون گـــەلـــەك

لـــێ طـــارِی[2] بـــوون دونیـــا ڤـــە ڕوون

دونیـــــا ل وان طـــــاری ڤـــــەبـــــوو

هـــاورێ ژبـــۆ وان قـــەط[3] نـــەبـــوو

ب تـــەنهـــا ل گـــورێ ســـۆختە[4] بـــوو

پـــڕ بـــوو ژ ئـــاخێ وان عیـــوون[5]

ئـــەو بـــێ هـــەڤـــاڵ و مـــەهـــدەرن

بـــەس وان عـــەمـــەل بـــۆ هـــەفســـەرن[6]

دیلـــــن[7] ل دەســـــتێ دەفتـــــەرن

كـــا وان عـــەمـــەڵ تێـــدا هـــەبـــوون

ڕابـــــە تـــــو زادی كـــــار بكـــــە

بـــۆ ئـــاخرەتـــێ تـــو ب چـــار بكـــە

مـــرن كـــو هـــات بـــاش بـــار بكـــە

بێـــــژە فلیعمـــــل العـــــاملون[1]

---

(1) مرن.

(2) تارِی.

(3) ل جهەكێ دیتر: قەت.

(4) (سوختە) پەیڤەكا فارسیە و ڕامانا (سۆتی) ددەت.

(5) ل جهەكێ دیتر: عیون؛ (عەین) پەیڤەكا عەرەبیە و ڕامانا (چاڤ) ددەت.

(6) ل جهەكێ دیتر: ئەفسەر.

(7) ئێخسیر.

مرن كو هات و مەلكولمەۆت[2]
وێ هەر دوو پێ ل مە كرنە جۆت
ڕوح نالی و تشتەك نەگۆت
هشیار ببن ئە غافلوون[3]

هشیار ببە بۆ خۆ ب تنێ
تو گۆهە نەدە كەڤنە ژنێ
لێكدە جیهازا مرنێ
لەزكە تو هەڤاڵ ل تە چوون

تو گوهە نەدە ڤێ ساحرێ
خۆ نەدە دەستی ماكەرێ
پاشی تو دێ خۆ ژ[4] بن برێ
چنجیلە ئەو هەر هات و چوون

وێ مەكر و فەنن[5] پوڕ[6] گەلەك
من هام بها قد هەلەك[7]
أين الذين قد ملك[8]
ماتوا وهم لايملكون[9]

---

(١) (بهێلە بلا كرێكار كار بكەن) سۆرەتێ (الصافات)، ئایەتا (٦١).

(٢) ئزڕائیل، عیزڕائیل.

(٣) (كەسانێن ئاگەهـ ل خوە نەبن) سۆرەتێ (الانعام) ئایەتا (١٣١).

(٤) ل جهەكێ دیتر: خۆش

(٥) حیلە.

(٦) ل جهەكێ دیتر: پڕ.

(٧) هەر كەسێ گرنگیێ بدەتێ دێ ژناڤ چیت.

(٨) ل كیڤەنە ئەوێن دەستهەلاتداری كرین.

(٩) واتە (ئەو مرن و نە خودان چ تشتن).

کــــا ئـــادەم و حـــەوا و شـــیس[1]
کــا نـوح و ئـەحیـا[2] و جـەرجـیس
کـــانێ ســـۆلەیمـــان و بـــەلقـــیس
داوود دگـــــەل وان ژێکڤـــــەبـــوون

ئیـــــدریس و عیســـــی ژێ بـــــرن
هــــارون و مووســــا ژێ مـــــرن
فیرعــــەون و هامـــــان بـــــن بـــــرن
ل پـێش وان ئـەوێ مـەقـدوونی[3] بـوون

کــــا صـــالح و لوقمــــان و ڵـــووط
کـــا طاطـەلـیس و کـــا طـــەلـووت
هــــارۆت و مــــارۆت هـــەر دو چـــوون
چـــوون و دگـــەل وان ئـــەفلـــەطـــوون

یـــەعقووب و یووســـف ژی نـــەمـــان
جــــەمشـــید و ججمشـــای زەمـــان
قـــەیصـــر و کیســـرای عـــەجـــەمـــان
ڕوســـــتەم و کـــەیخســـرەو زەنـــون[4]

کـــانێ هـــەمـــی میـــر و ملـــووك
کـــانێ ئـــەوێـــن صـــاحب ســـلووك

---

[1] (شیپ) کوڕێ ئادەم پێغەمبەری (س) بوو.

[2] یەحیا پێغەمبەر کوڕێ زەکەریا پێغەمبەری (س) بوو.

[3] ئیسکەندەرێ مەقدونی.

[4] جمشید، ججمشاه، قەیصەر، کیسرا، ڕۆستەم و کەیخسرۆ ڕامانا (شاه و دەستهەلاتدار) ددەن.

کانێ خودان باجار[1] و سووك
چوون و د ئەرضی[2] بەرزەبوون

کانێ ئەوێن صاحب طەریق[3]
کانێ خودان ڕۆتبە و فەریق[4]
ڵ دەریایێ گۆڕێ بوون غەریق[5]
چوون هەمی کاسیدە[6] بوون

ئەو عالم و ئەو جاهلا[7]
ئەو عاقل و ئەو غافلا[8]
پێکڤە ب مرنێ موبتەلا[9]
قەط[10] مەهدەرەك ئەوان نەبوون

کانێ گەل و ئاغا و میر
کا بەگلەر[11] و کانێ وەزیر
ل مرنێ هەمی بوونە فەقیر

---

(1) بازێڕ.

(2) ئەرد.

(3) خودان ڕێباز (ڕیباز سۆفیگەری).

(4) پلە و پۆست.

(5) خەندقین.

(6) ژ پەیڤا (کاسد) هاتیە وەرگرتن و د زمانی کوردی دا ڕامانا (سست و نەڕەوا) ددەت.

(7) نەزانان.

(8) نە ئاگەهداران.

(9) تووشبوویان.

(10) ل جهەکێ دیتر: قەت.

(11) پەیڤەکا مەغولیە و ڕامانا (مەزن، و ئاغا و خان و ...) ددەت.

ئێکێ ژ وان ڕۆتبە[1] نەبوون

ل مرنێ هەمی ئەسیر و دیل
بێ فایدەنە هەر قالٚ و قیل
بەس بوون هەر عەمەل دەلیل
کا چی ژبۆ تە کۆم ڤەبوون

کاچی تە بۆ خۆ کۆم ڤەکر
ژ خێرا ئەوە تە دگەل خۆ بر
مال و گوڕا فایدە نەکر
هەر دوو دگەل تە ژ ئێکڤەبوون

دگەل ئەوان دێ بێ جودا
چێ پێش بەرێ زاتێ خودا
پاشی جەوابا خۆ بدا
ئەی ڕوی ڕەشی و ئەی سەرنخوون

کانێ ئیمامێ ئەنبیا[2]
کانێ سەرۆکێ ئەصفیا[3]
ما کا چراغێ ئەولیا[4]
سەرۆک ژبۆ وی بەندەبوون

کانێ شڤانێ ئومەتێ
کا مەهدەرێ شەفاعەتێ[1]

---

[1] پله، پایه.

[2] پێغەمبەران.

[3] هلبژارتیان.

[4] واته (باوەرداران و سەرپەرشتان).

کانێ هەڤالێ هیجرەتێ[2]
چوون و نعم الماهدون[3]

کانێ عومەر کانێ عەلی
کانێ فەتەن ئێ مۆبتەلی
نێ دین ب ڤان بوو مونجەلی[4]
ماتوا ونعم الذاهبون[5]

ئەصحاب و ئال ئێك ژێ نەمان
پێکڤە دگۆڕێ ئەو جەمان
قەط[6] کەس ژ وان پاشڤە نەمان
چوون ونعم الراحلون[7]

کانێ گەلۆ هەر چار ئیمام[8]
کانێ ئەوێن صاحب مەقام[9]
مرنێ برن ئەو خاص و عام[10]
پێکڤە ل ڤێ رێ ڕستە بوون

مادەم دزانێ ڤێ هەمێ

---

[1] بەرەڤانی.

[2] مەبەست ئیمام ئەبوبەکرە ئێکەم خەلیفێ ڕاشدین.

[3] ل جهەکێ دیتر: الراحلون؛ واتە (باشترینی بەلاڤکەران).

[4] ڕۆهن و ئاشکرا.

[5] واتە (باشترینی ییێن چووین).

[6] ل جهەکێ دیتر: قەت.

[7] ل جهەکێ دیتر: الماهدون؛ باشترینی بارکریان.

[8] ئیمام ئەبو حەنیفە، ئیمام مالك، ئیمام شافعی و ئیمام حەنبەلی.

[9] خودان پلە و پۆست.

[10] تایبەت و گشتی.

بـــــــۆچی د ڕازێ ڤـــــێ دەمـــــێ
مـــا طـــڕس تــــە نینــــە ژ جــەهنــەمــێ
ئــــەڤ شـــیرەتــــە بیهـــودە[1] بــــوون

ڕۆژ و شــــــەڤــــا طاعـــــەت بکـــــە
هــــەردەم بـــدە نـــەفســـێ چکـــە
دزانــــــی قیامــــــەت بـــێ شــــکە
بـــۆچی هـــەمـــی باشـــی ل تـــە چـــوون

دزانـــــێ قیامــــــەت وا هـــــەیـــــە
ژینـــــا دنـــــێ بـــــێ فایـــــدەیـــــە
مــــــرۆڤ ددەســــــتی بــــــەنــــدەیـــــە
تـــــەوبــــە بکـــــە بـــێ لێڤـــەبــــوون

ڕابـــــە بکــــە دائـــــیم عـــــەمـــــەل
پـــڕ شــەوق و بـــێ سســـتی و مـــەلـــەل
وەختـــە بگـــەهیـــتن تـــە ئـــەجـــەل
دگـــەڵ یـــار و دۆســـتا ژێکڤـــەبـــوون

دونیـــــــا وەکــــــــی وارێ بهـــــــار
چـــەنـــد ڕۆژەکـــا مـــەتـــێ بـــووار[2]
پاشـــی ڤـــەرێ بـــوون ســـەر شـــووار
تـــالی گـــو[3] گـــۆڕ وارێ مـــە بـــوون

دونیـــــا ژیـــــۆ مــــــە وارگــــــەهــــــە

[1] (بیهودە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (بێ مفا، بێ قازانج، بێ بەرهەم و...) ددەت.

[2] مە تێدا بووراند.

[3] دویماهیێ گۆت.

تێـــدا دژیـــن صـــاڵ و مـــەهــــە
پاشـــی ئـــەوی تـــالی هـــەنـــە
بـــارکر ئـــەوی ل پێشـــیا مـــە چـــوون

دونیـــا شـــەڕابـــا هنگڤـــین
چـــەنـد جورعـــەیا[1] دێ ژێ ڤـــەخـوین
پاشـــــی دبـــــن دەرد و بـــــرین
پێکڤـــە هـــەمـــی ئـــەم مـــردە[2] بـــوون

دونیـــا شـــەریتـــا ســـینەمـــێ
هـــەر وەك فلیمـــێ ڤـــێ دەمـــێ
ل بـــەر وان تـــو جـــارا بـــێ غـــەمـــێ
یـــەك یـــەك ژتـــە ڕابـــووردە بـــوون

دونیـــا دبێـــژێ گـــەشـــتی یـــە
ڕیبـــار د نـــاڤێ نشـــتی یـــە[3]
هـــەردەم ژخـــۆ بـــێ هێڤـــی یـــە
تـــا ئـــەو ل دەریـــا دەرڤـــە بـــوون

دونیـــــا وەکـــــی دۆلاب دوور
هنـــدەك ل ژێـــر هنـــدەك ل ژوور
هشـــیار بـــە تـــازە تـــێ ببـــوور
نـــێ مـــارەکـــۆر وەك وێ نـــەبـــوون

دەســـتا تـــو بـــەردە ژ ڤـــێ دنـــێ

---

[1] قۆڕچك.

[2] مری.

[3] دانایە.

طـــەلاق دە ڤـــێ کـــەڤنـــە ژنـــێ
دا بـــەرهـــەمـــی بـــۆ خـــۆ بچنـــێ
ل وێ جـــەننـــەتـــا تـــازە و بـــژوون

یـــا ڕەبـــی ئـــەز بـــەنـــدێ تـــەمـــە
ڕەحمـــێ نـــەکـــێ بـــێ چـــارەمـــە
دزانـــم کـــو مـــن عـــەمـــەل کـــەمـــە
مـــا باشـــە بـــۆ مـــن پاشـــڤە چـــوون

یـــا ڕەب ب حـــەقـــێ ئـــەحمـــەدی
ڤـــی بـــەنـــدەیـــی ئـــازار نـــەدی
تـــو ب لوطـــف و ڕەحمـــێ بـــێ حـــەدی
بـــەخشـــینە بـــەنـــدەی دل بخـــوون

بـــەخشـــینە بـــەنـــدە ســـندی یـــە
هـــەردەم ئـــەوی ژتـــە ب هێڤـــی یـــە
گـــەر وی ببـــەخشـــی مـــاچی یـــە
چبکـــەك ژ بـــەحـــرێ کـــێم نـــەبـــوون

چـــەن[1] کـــەس ژبـــۆ تـــە نـــاکرن
پاشـــی تـــە ئـــەو ئـــازا کـــرن
برنـــە بـــەهشـــتێ شـــا کـــرن
تشـــتەك ژ ڕەحمـــێ کـــێم نـــەبـــوون

یـــا خـــوا ببـــوورە ل مـــە هـــەمـــە
ڕەحمـــا تـــەبـــێ گـــاڤ و دەمـــە
طرســـا مـــەزن هـــەر جـــەهنـــەمـــە
تێـــدا هـــەر و هـــەر کـــافیروون

---

[1] ل جهەکی دیتر: چەند.

ئـەی گوهـدەرێ[1] ڤـێ قصـەتـێ[2]
ئامـــادەئـــێ نـــەصـــیحەتـــێ[3]
یـــارەب نـــەبینـــێ زەحمـــەتـــێ
گـــەر فاتحـــە ژبـــۆ مـــن بخـــوون

---

[1] ئەو گوهداریێ دکەت.

[2] داستان، چیرۆك.

[3] شیرەتێ.

## مالا[1] بەندا

خودێ قورئان هنارتە بۆ موحەممەد
کو قانوونە ژبۆ دونیا و دینی
هەمی ئەحکام و ئاداب وێ بەیانن
نەکو تشتەك ژ ئەحکاما نهێنی
چ تشتی گۆتی پێکڤە بۆ مە ڕاستە
دزانم ئەز ئەڤی بعلم الیقینی[2]
ئەگەر باوەر نەکێ ب ڤێ گۆتنا من
یەقین تو کافرەك زۆری لەعینی
خودێ تێدا بەیان کر بۆ مە هەر تشت[3]
ل سەر مە فەرض کرن پێنچ ڕۆکنێ دینی[4]
ژ ئەوەل شەهەدەیە ئێدی نڤێژن
ژ وان چێد بت خۆشی و پاکی و بژینی
زەکات و ڕۆژی و حەج هەر سێ دی
سۆپاسدارین ژ یەزدان بۆ ڤی دینی

---

[1] مالکا.

[2] زانینا تشتەکی ب پشتڕستی.

[3] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (ما فرطنا في الکتاب من شيء)، سۆرەتێ (الانعام)، ئایەتا (٣٨).

[4] ژ فەرموودا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (بني الاسلام علی خمس شهادة ان لا اله الا الله و ان محمد رسول الله واقام الصلاة وایتاء الزکاة وصوم رمضان و حج البیت).

هەیین شەش ڕۆکنێ ئیمانێ بزانە

فەرە ل سەر تە ب وان باوەر بئینی[1]

بکێ باوەر ب یەزدان و مەلاکان[2]

ب کتێب و پێشڕەوا[3] و ڕۆژا نهێنی[4]

چ خێر و شەڕ هەمی ب دەستێ خودێیە

د ڤێ شادمانی بێ و سەر پێ هلینی

هەچی تشتی گۆناهە لازم نەکی تو

ئەگەر ڕاستە مرۆڤەك تو ب دینی

زەکات و خێرا تو بدە بۆ هەژارا

گەلەك باشە بدێ وان تو ب نهێنی

ئەگەر خێر و زەکاتا تو نەدێ وان

خودێ بکم تو چو خێرێ ژێ نەبینی

دگەل جیرانا زۆر باش و نەرم بە

کو فەرمان هوصا[5] کریە بۆ مە دینی[6]

خودێ گۆ[7] جارێ قوربا[8] و ل طەنشتێ[1]

---

(1) مەبەست هەر شەش ستوینێن ئیمانێنە: باوەری ب خودێ و فرەشتە و پەرتووك و پێغەمبەرێن وی و ڕۆژا قیامەتێ و خێر و شەڕان.

(2) مەلائیکەت، فرشتە.

(3) ڕێبەر.

(4) ڕۆژا قیامەتێ.

(5) هوسا.

(6) ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (والجار ذي القربى والجار الجنب و الصاحب بالجنب)، سۆرەتێ (النساء)، ئایەتا (٣٦).

(7) گۆت.

(8) نێزیك.

دڤێت ڕوو خۆش تو هەردەم وی ببینی

دزی و کۆشتن و زنا زۆر پیس و نەحسن

ب ڤانە ل هەر دوو مالا سەر چەمینی[٢]

خەلیفێ ئەوەلی بوبەکرێ شێخە

ل شکەڤتێ هەڤال بوو بۆ ئەمینی[٣]

دووەم فارۆقە هیچ کەس وەك وی نینە

ئەگەر باوەرنەکێ مێژوو بخوینی

سێیەم عوپمانێ ب شەرم و حەیایە

ئەوی مالێ خۆ صەرف کر[٤] بۆ ڤی دینی

عەلی ئەلمۆرتەچا چار پێ تەمامن

ئەوە دەرگەهـ ژبۆ باجێری دینی[٥]

ئەئمێ[٦] موجتەهد پێکڤە دەلالن

گەلەك زەحمەت ئەوان بر بۆ ڤی دینی[٧]

---

[١] ل جهەکێ دیتر: تەنشتێ.

[٢] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (والسارق والسارقة فاقطعوا ايديهما)، سۆرەتێ (المائدة)، ئایەتا (٣٨)؛ ئایەتا (ولاتقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلا)، سوڕەتێ (الاسراء)، ئایەتا (٣٢).

[٣] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (ثاني اثنين اذهما في الغار يقول لصاحبه لاتحزن ان الله معنا)، سۆرەتێ (التوبة)، ئایەتا (٤٠).

[٤] مەزاخت.

[٥] ژ فەرموودا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (انا مدينة العلم وعلي بابها) و (واعلمكم علي).

[٦] ئیمامان.

[٧] ژ فەرموودا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (لايجتمع علماء امتي على ظلال).

بایـــەغ و تـــوخێ شـــەرعـــێ برنـــە گـــەردون

بـــەیان کـــر بـــۆ مـــە گشـــت تشـــتێ نهێنـــی

مـــــەلایـــــێ بـــــاش ل شـــــوونا[١] ئـــــەنبیانـــــە

ئـــەگـــەر بـــاوەرنـــەکـــێ ئبلـــیس حـــەبینـــی[٢]

خۆدێ ل وان خۆش ببت پێکڤە هەڕ و هەر

بـــــەهشـــــت جهـــــبن ل ڕۆژ ئـــــاخرینێ[٣]

نـــەیـــاری دگـــەل مـــەلا و دینـــی خڕابـــە

ئـــەگـــەر تـــو بکـــێ یـــەقـین دێ خـــۆ خڕینـــی[٤]

خـــودێ خـــۆش بـــوو ژ ئـــەنصـــار و مهـــاجر

ئـــەگـــەر فـــەکـــرێ تـــو دێ ل قورئـــانێ بینـــی[٥]

هـــەڤـــالێ ئـــەحمـــەدی[٦] پێکڤـــە عـــەزیـــزن

ل ســـەر قـــەولـــێ وان بلنـــد بـــی بوڕجـــا دینـــی[٧]

تـــو قـــەدر و ئیحتیڕامـــا بگـــرە بـــۆ ڤـــان

ئـــەگـــەر نـــە تـــو کـــەرەك ماکـــەر چرینـــی

---

[١] ل شوینا.

[٢] ژ فەرمووداپێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (العلماء ورثة الانبیاء) وقال (علماء امتي افضل من انبیاء بني اسرائیل).

[٣] قیامەتێ.

[٤] خوە سەردا ببی.

[٥] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (والسابقون الاولون من المهاجرین والانصار والذین اتبعوهم باحسان رضي الله عنهم و رضوا عنه)، سۆرەتێ (التوبة)، ئایەتا (١٠٠).

[٦] مەبەست موحەممەد پێغەمبەرە (س).

[٧] ژ فەرمووداپێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (لو یجمع اهل الدنیا کلهم لم یبلغوا نصف اصحابي ولا ثلثهم ولا مدهم).

نـەكـێ زەمـا[١] چـو ئـەصـحاب و ئیمامـا
ئـەگـەر پاشـی ل جـەهنـەم دێ تـو ڕوینـی

ئـــەگـــەر بێــژی وەكـــی وان ئـــەز دزانـــم
تـو بـەد[٢] ئـەصـل و یـەقـین سـفره دڕینـی

بكـی شـۆلەك موخـالف بـت ژبـۆ دینـی
یـــەقـــین پـــەردا حـــەیـــایێ دێ دڕینـــی[٣]

چ هـۆش و ژیـر خـودێ دانـە سـەرێ تـە
گـــەلۆ مـــا تـــازەیـــە تـــو ژێ دەرینـــی

بێــژی تـــو ئـــەزێ خـــۆم بـــادەیـــا خۆشـــی
تـــو دێ مـــێلاك و گـورجـــا پـــێ ڕزینـــی

مـە دی بچاڤێ خۆ چەن[٤] كەس پێ ڕەزیـل بـین
ئـــەرێ بـــۆچی ئـــەوێ تـــو د فڕفڕینـــی

هـەچـی تشـتی ب وی سـەرخـۆش ببـێ تـوو
نـە ب نێزیـك ئـەگـەر یـەزدان حـەبینـی

خڕابــە هـــەم ب گـــورەی تـــەندورســـتی
گـەلـۆ مـا تـو لـەشـێ خـۆ نـا حـەوینـی

ڕەســوولی گـۆ[٥] بخـوینن هـوین ژن و مێـر
بـــرا ڤێجـــا دڤێـــت هـــەر تـــو بخـــوینی[١]

---

[١] ب نەباشی باس نەكە.

[٢] (بەد) پەیڤەكا فارسیە و ڕامانا (نەباش) ددەت.

[٣] ژ فەرموودا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (ان لم تستحي ولم تخف فاصنع ما شأت).

[٤] ل جهەكێ دیتر: چەند.

[٥] گۆت.

ب علـــم و خوانـــدنێ عالـــەم گـــەهشـــتی
ب علمـــی تـــو دشـــێ هـــەر تشـــت دەرینـــی[٢]

ب زانیـــــاری و علمـــــی تـــــو د كـــــاری
بچـــێ ل ســـەر طـــارمێ[٣] ژووری تـــو ڕوینـــی

ئـــەگـــەر تـــەعلـــم و زانیـــاری دگـــەل بـــت
دگـــەل میـــر و ملوكـــا دێ تـــو ڕوینـــی

ئـــەمـــین ئیـــرۆ هـــەژار و ڕووت[٤] پێخـــاس
ژبلـــی علمـــێ تـــو حـــالێ مـــە دبینـــی

هـــەمـــی پێكڤـــە غـــولامین[٥] ئـــەم بجـــارەك
ژبـــۆ خـــەلكـــێ ل ســـەر ڕویـــێ زەمینـــی

هـــەمـــی مللـــەت ب عیلمـــی بوونـــە ئـــازا[٦]
تنـــێ ئـــەم بـــەنـــده و هـــەم دلبرینـــی

چ زۆرداریێ بكـــــەت زۆرداریـــــا تـــــە
دڤێـــت چـــاك ل بـــەر وی دەســـت هلینـــی

هەكە تو دەست نەهلینێ[١] ل بەر نەیاری

---

[١] ژ ئەڤان فەرموودەیێن پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (طلب العلم فريضة على كل مسلم و مسلمة) وقال (اطلب العلم ولو بالصين) وقال (اطلب العلم من المهد الى اللحد).

[٢] ژ ئەڤان فەرموودەیێن پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (قل هل يستوي الذين يعلمون و الذي لايعلمون)، سۆرەتێ (الزمر)، ئایەتا (٩).

[٣] تارمە.

[٤] ل جهەكێ دیتر: قوت.

[٥] ل جهەكێ دیتر: خولامێن.

[٦] ل جهەكێ دیتر: ئازاد.

ب راستی تو مرۆڤەك كێمە دینی[2]
ب ئێكەتی دگەل خزم و مرۆڤا
تو دێ شێ هەر نەیارێ خۆ ڕەڤینی
ئەگەر تو و خزم و خۆنێ خۆ ببن ئێك
تو دێ شێ قەید و زنجیرا بچینی
خۆدێ دبێژیت وەكی لبنێ ل سەر یك بن
هەكە وە بكێ برا دێ خێرێ بینی[3]
ووشا خۆشن خێرە بۆ خەلكێ تو بێژە
ب دەڤ نەرمی تو دێ خەلكێ چەمینی[4]
ب ئەزمانێ خۆش و نەرمی تو دێ شێ
زها مارا ژ كونێ وان دێ دەرینی
نە ئەزمان زێدەیە و پڕبێژ و بێ هۆش
ئەگەر نە تو مطرپەك كەو خورینی
ڕویێ طرش و دلڕەق هەر دو پیسن
ب وان دێ هەر كەسێ ژ دوور خۆ ڕەڤینی
ئەگەر هاتن ژبۆ تە هندە مێهڤان
دڤێتن تو ب وان خۆشی سەر هلینی[1]

---

[1] هەوڵدان، بزڤین.

[2] ژ فەرموودەیا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (من قتل دون ماله أو نفسه أو عرضه فهو شهيد).

[3] ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (الذين يقاتلون فى سبيله صفا كأنهم بنيان مرصوص)، سۆرەتێ (الصف) ئایەتا (٤)؛ هەر دیسان پیغەمبەر (س) دبێژیت: (المؤمن للمؤمن كالبنيان يشد بعضه بعضا).

[4] ژ فەرموودەیا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (القى اخاك بوجه طليق).

ئەگەر چەن[٢] صالێ ئێك بۆ تە ببت دۆست

دڤێــت ئێــك جــار ب وی بــاوەر نــە ئینــی

نەبـاش و ئـەحمـەقا بـۆ خـۆ نـەکـە دۆسـت

نــەشــێ شــۆلا دگــەل وان ڤــەلڤینــی[٣]

نـەکـە بـۆ خـۆ هـەڤـال و دۆسـت ئـەڤانـە

هــەکــە پاشــێ تــو دێ ڤــەچــڤ چڤینــی

بــدە دوژمــن ســەرێ مــار ب تــەمــامی

برێــژە حــەفکــا دوســتی هنگڤینــی[٤]

ئـەگـەر چـەن[٥] مێـرەکـێ بـاش بـی ئـو دژوار

دڤێــت ئێکــێ ژ خــۆ مێرتــر ببینــی

ئـەگـەر چـەن[٦] تـو ب علـم و زانیـاری بـێ

هـەنـە زانـا نـەشـێ ل نـك وا تـوو ڕوینـی

ڕەســولی گــۆ[٧] پچــەك علمــی دزانــم

دگـەل وێ هـەر ئـەوە سـەرەکانیـا دینـی[٨]

ژنــێ بینــە بــرا د لاوینیــێ ڕا

تــەمامکــە تــو ب وێ ئــادابێ دینــی

---

(١) ژ فەرموودەیا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: ( اکرام الضیف واجب).

(٢) ل جهەکێ دیتر: چەند.

(٣) ژ فەرموودەیا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (المرأ مع من أحب).

(٤) (ئیبن درید) دبێژیت: (طعمي شري للعدو تارة والاري بالراح لمن ودي ابتغى).

(٥) ل جهەکێ دیتر: چەند.

(٦) ل جهەکێ دیتر: چەند.

(٧) ل جهەکێ دیتر: گۆت.

(٨) ژ ئەڤێ ئایەتێ هاتیە وەرگرتن: (وما اوتیتم من العلم الا قلیلا)، سۆرەتێ (الاسراء)، ئایەتا (٨٥).

بەلێ ئێکا ب دین و باش تو بینە
بەیانکە بۆ مە ب ڤی ڕەنگە ئەمینی[١]
هەکە شوق باش و شۆلێ وێ حەلال بت
تو دێ بەرخۆرەکێ باش ژێ هلینی
بەرێ خۆ تو نەدە ناموسا خەلکی
دگەل ژنکا ب تنێ تو قەط[٢] نەڕوینی[٣]
نەچاڤ نێرێ دەرێ خەلکێ بە شەرمە
دڤێتن تو ئەڤان پەندا هلینی
کچ و خویشک[٤] و ژنێ تە دڤێت ستار بن
نەهێلە وەرگرن بەرگێ جوهینی
تو بگرە دین و ناموسا ب تەمامی
ئەگەر نە پاش تو دووژەهێ نشینی
ئەدەب دە بچووکێ خۆ ژ ئەوەل
شڤک[٥] تەڕ بت تو دێ شێ باش چەمینی
مەزن بن ئەو ب چو تەڕزا[٦] نەشێ وان
وەکی دارێ هشک دێ وی قڕینی

---

[١][١] ژ فەرموودەیا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (تنكح المرأة لأربعة خصال لمالها وجمالها وحسبها ودينها فأظفر بذات الدين تربت يداك) هەر وەسا هاتیە: (هلا بكرا تلاعبها و تلاعبك).

[٢] ل جهەکێ دیتر: قەت.

[٣] ژ فەرموودەیا پێغەمبەری (س) هاتیە وەرگرتن: (ويحرم الخلاء من الاجنبية و ما اجتمع رجل و أمرأي الا والشيطان ثالثهما).

[٤] ل جهەکێ دیتر: خوشك.

[٥] جیڤ، دار.

[٦] ب چ شێوەیا.

وەیـا خــۆ دێ تــە دەرکــن ئــەو ژ مــالێ
وە یــــا دێ وان ژ هێلینـــــــێ فڕینــــــی
ئـەگـەر گۆهـ تـو نـەدێ مـن ئـەی بـرادەر
تــو دێ ژ قــەهــرا زکــێ خــۆ زوی دڕینــی
کچـا تـە هاتـە شـوی زوی بـدە جهـوره[1]
بـــدە ســـەر ئێکـــێ دا خێـــرێ ببینـــی
ئـەگـەر تـو وێ نـەدەی شـوی شـەرمـە بـۆ تـە
ب پۆشـــمانی ســـەری دێ تـــو نڤینـــی
نـەبـە هـەڤـال دگـەل قـورتی[2] چـو جـارا
ئـەگـەر نـە دێ مێلاکـێ ل خـۆ صـمینی[3]
هـەڤـالێ دگـەل قـڕێ هـەر نکلـێ پیسـە
بـــرا بـــۆچی دگـــەل وێ قرقڕینـــی

(١) شووی.
(٢) جۆرەکێ بالندەیانە، ل ئەسمانی دفڕت و مەزن و بلندن.
(٣) کونکرن.

## بەهشت

گەر دبێژن نێ کۆ جننەت هەر وەکی خانەقەیە[١]
چەند مرید و شێخ و صوفی دێ چنێ هەر بوو مەیە
غەیری ڤانە کافرن عالەم قەوی کەس ناچتێ
ڕێبەر و زانا منەور[٢] تالیان[٣] هەر فیشەیە[٤]
شێخ بلا دائیم خەریکێ[٥] کۆشتن وفسق و فجور[٦]
نێك و پێك و جەرد و تالێن سیخوری قەیدی نەیە
چونکە ئەو صاحب طەڕیقن پرس ژ وان قەط[٧] ناکری
فاسق و بێ دین ل نك وان فانیێ (فی اللە) هەیە
ئەو دبێن[٨] جنەت ب ڕەدین نە ب زانین و علم
صەد کەسی وەك شافعی[٩] بها ل نك وان عانەیە[١٠]
گەر بزانم کو بەهشت بوویە طەویلخانا[١] کەرا

---

[١] خانەقا یان تەکیا جهێ لهەڤ جڤیانا سووفیانە.

[٢] ڕۆناهی.

[٣] دویماهی، داوی.

[٤] یا ژ خۆەیە، ژ زاراڤێ سۆڕانی هاتیە وەرگرتن.

[٥] مژویلی، ژ زاراڤێ سۆڕانی هاتیە وەرگرتن.

[٦] کارێن نەڕەوا و دویری ئەخلاقی.

[٧] ل جهەکێ دیتر: قەت.

[٨] ل جهەکێ دیتر: دبێژن.

[٩] ئیمام شافعی.

[١٠] پارە.

دووژەهـــا[٢] پـــيس بوويــه زينـــدا مــەلا و ئـــەفســـەرايــه

ئـــەز ژ يـــەزدانــــى دخـــوازم ب حورمــــەتـــا پێغـــەمبـــەرا

مـن نـەبـت وێ جـەنـنـەتـا صـوفى نشـين وەك طـەولـەيـه

ئـەز دخـۆم صـۆندى[٣] ب يـەزدانـى ئـەڤ خيالـه بـێ بنـه

ئـەز دزانـم مـن چ گـۆت هـەرچـى مـن گـۆتى وەك منـه

بـــاڤێ وێ ل نـــك خـــۆ چـــونكى پيســـه و چلكنـــه[٤]

غـەيـرى زانـين و علـم هـەر تشـتێ بـت بـێ فايـدەيـه

---

[١] جهێ ڕاگرتنا هەسپان.

[٢] دۆزەخ.

[٣] ل جهەكێ ديتر: سوندێ.

[٤] پيسه.

## قوتابخانا نوردینا[١]

قوتابخانا نوردینا ... ڕیبەر یێروەندێ دینە
بێ نامووس و لەعینە ... بابەتێ شیخبزدینە
دەما مدیت[٢] نە باشە ... وە کی دینا هەر شاشە
ملێدان[٣] چەندی طوبز[٤] ... بیە مسعار و ئاشە[٥]
سەعەت دازدەی[٦] سحارێ ... ل هدر غۆڕفا ئیدارێ
وەکی کەری مقوتا[٧] ... مژ[٨] تەختی ئیناخوارێ
مە گۆ[٩] ئەی شێخئیزدینن ... وەرن بخو ببینن
سەرا وی دەست هلینن ... دا پاشی هوین خو ببینن
معەلمەك قەیصەر بی ... لاوەکێ دلا وەربی
زۆری باش و ب زەڤەر[١٠] بی ... چنگی وەکی جەوهەر بی

---

[١] گوندێ نوردینا سەر ب دەڤەرا سندیان ڤەیە، ئەڤ هەلبەستە د ناڤبەرا سالێن(١٩٦٠-١٩٦١)ێ دا هاتیە نڤیسین.

[٢] من دیت.

[٣] من لێدان.

[٤] توبز (دار و گوپال).

[٥] لێکزڤرین.

[٦] دوازدە.

[٧] من قوتا (من لێدا).

[٨] من ژ.

[٩] گۆت.

[١٠] زیرەك.

## قوتابخانا دێرەبوون[1]

ئەز چوومە دیرەبوونێ
تە دڤێت تو هەر لێ ڕوینێ
فلهێ وێ گەلە باشن
تو دشێ دگەل وا بوورینێ

گورگیسینێ مە مدیر[2] بی
لێ ڕاستی بێ تەقصیر بی
مدیرەکێ ب تەدبیر بی
کوڕەکێ زۆر فەقیر بی

بطرس تو خۆش هەڤالی
ب ڕاست تو شیر حەلالی
گەلەك ڕەند و دەلالی
وەکی ئاڤا زەلالی

ئیسماعیلێ حەیدەری
تو نیشتیمان پەروەری
هەرو هەر بۆ عەنفەری
برا تو ل سەر ڤی سەری

ئیسماعیلی یەزیدی
وەکی زێڕی حەمیدی[1]

---

(١) دێرەبوون سەر ب دەڤەرداریا زاخۆ ڤەیە، ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٦٤)ێ، هاتبە نقیسین.

(٢) ڕێڤەبەر.

چ گەوهەرەك فەریدی[٢]
باشی گەلە[٣] مە شوی[٤] دی

موعەلمەك داوودە
فەقیرەكێ بێ سودە[٥]
بێ ضەرەڕە[٦] نە حەسوودە
بێ نەفعە[٧] و ئەو بێ جوودە

---

(١) ئەڤ زێڕە ب ناڤێ سوڵتان عەبدولحەمیدێ عوسمانی هاتیە ناڤكرن.

(٢) بی وێنەی.

(٣) گەلەك.

(٤) ژ وی.

(٥) بێ مفا و بێ قازانج.

(٦) بێ زیان.

(٧) بێ مفا، بێ قازانج.

## قوتابخانا ئەصدێدا سەری[1]

ئەز نەفی بیم ئەصدیدا[2] نەهـ صەد و شێست و چارێ
ل ناڤ مێر و جامێرا تا دووماهیا بهارێ
ئەو جهێ خێر و بێرا بەرانبەری زنارێ

رێبەبەرێ[3] قوتابخانێ ل وێرێ ئیبراهیمە
راتبت[4] ژ خەو بەیانێ باشە بەلێ خشیمە
ئەو خەلکێ جوبەخانێ ئەز نە هەڤالێ وی مە

مام هستایەکێ[5] زانا نێ ناڤێ وی نەجیبە
بۆ گەوهەرا وەك کانا مەردەمێرە و لەبیبە[6]
ئەمنێ[7] خۆ لبەر وی دانا ئەو ژی وەك من غەریبە
موعەلمەك[8] صالحە عەرەبە جبوورییە[9]

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٦٥)ێ هاتیە نڤیسین.

(2) گوندەکە ل دەڤەرا (شرقات) سەر ب پارێزگەها مویسلێ ڤەیە.

(3) رێڤەبەر.

(4) رادبت.

(5) ماموستایەکێ.

(6) زانا و شەهرەزا.

(7) ئەوێن ب کاروبارێن ئەمن و ئاسایشێ رادبوون د گۆتنە ئەوان دەزگەهێ (ئەمن)ێ.

(8) ماموستا.

(9) جبووری ئێك ژ هۆزێن مەزنێن عەربە کو پتریا ئەوان ل هەر چار وەلاتێن عیراق، سوریێ، سعوودی و ئوردنێ دژین.

نە مروڤەك فالحە[1] … ئەو بێ قەدر و بێ ڕوییە
ئەو ڕووت ڕەشە و كالحە[2] … ڕاستی ئەو فیعل[3] جوهییە

هەڤالەك دی حەننەیە … ئەو ژ خەلكێ ئەلقووشێ
وی كوودە واری هەیە … دل صافیە وەك شووشێ
هەمی گاڤا ل نك مەیە … هەر بژیت كورێ مووشێ

برادەرەك هادییە … چ كوڕەكێ لەوەندە
سەرفەراز و ڕووسپیە … چ شەكر چ قەندە
ئەصلێ وێ حەلاویە[4] … چ خوشكوك و چ ڕەندە

---

(1) سەركەڤتی.

(2) دژوار و توند.

(3) كریار.

(4) ڕەنگە مەبەستا وی باژێرێ (حلە) بیت كو ئێك ژ باژێرێ عیراقێ یە و دكەڤیتە (١٠٠كم) باژێرێ بەغداد.

## قوتابخانا خابوور

قوتابخانا خابوورە
ژ باجێری[1] پچەك دوورە
بەرامبەری بەرزوورە
ئەو تژی علم و نوورە

رێبەرێ وێ بشارە
خۆش برایە و خوش یارە
دەواما مە دوو جارە
یەك سحار یەك ئێڤارە

هاریكار مە مەهەییە
كۆڕەكێ جندییە[2]
خوش لاوە و ئەفەندییە
ژ مێژڤە من ئەو دییە

مامۆستایەك كاملە
برایەك زۆر ب دلە
مەردەمێر و نەجلە[3]
بۆ كەنی وەك بلبلە

---

(١) بازێڕ.

(٢) باشە.

(٣) ب ڕە و ڕڤشتە.

برایەك مە ئەحمەدە
وەكی میریێ ل سەرحەدا[١]
وی دین گرت و بەرنەدا
ڕوون[٢] و شەفەق[٣] ژێ ڤەدا

سیدایەك مصطەفایە
چ لاوەكێ ب وەفایە
بێ جەور[٤] و ب وەفایە
وی كەس ئازار نەدایە

برایەك دی مەجیدە
وی لە خەباتێ ڕوێدە
وەك پیلا[٥] و حەدیدە[٦]
عەینەن دوورا فەریدە[٧]

سیدایەك دی ساوایە
گەلۆ ما ئەو چاوایە
هند مەندە و بەلایە
هەڕوت[٨] بیژێ زاڤایە

---

[١] سنوور، توخیب.

[٢] ڕۆناهی.

[٣] ڕۆژئاڤبوون.

[٤] ستەم.

[٥] ئاسنێ بهێز و نەهێتە چەماندن و شكاندن.

[٦] هەر

[٧] تەكە.

[٨] هەڕۆ د.

مامۆستایەك قەیصەرە
لاوەكێ دلاوورە
ئاشتیخوازە و بی بەرە
بۆ مێهڤانا بێ دەرە

عبدولمەسیح ئێك ژ مە
هەڤالە و وەكی خزمە
سەربلندە و نە نزمە
دگەل مە وەك كرز و خزمە

برایەك دی یووسڤە
ج بێژی ئەو نەلڤە
بێ دەنگ و گڤە گڤە
شرین وەكی هنگڤە

هەڤالەك مە نیشانە
ئەو یێ بێ ئێش و ژانە
وەكی بەفرا كێوستانە[١]
دەرمانێ بریانە

برایەك وە نۆرییە[٢]
ژ عەشیرا سندییە
ل گەلەك جها گەرییە
وی هەر ئومید كوردییە

[١] كویستان، زۆزان.

[٢] نۆڕەدین خودان ئەڤێ دیوانێ.

ئەم هەژدە وەك برانە

بێ نەخۆشی و بەلانە

خزمەتچیێ جیهانە

كوڕی شێرێ چیانە

## مەلايێ كۆرە

چووم دهوكێ دابخوينم
نك مەلا عەبدولهادى

ل مزگەڤتا وى چەنەنو
فەقيێ وى نەبن ڕادى

چوومە[1] مزگەڤتا موفتى
ل ويرێ دا ئەز ڕوينم

بەلێ تحصل و دەرسا
ل نك سەيدائى بخوينم

پاشى بەرێ خۆ د دەمێ
ئێكێ كورە وێ ل وێرێ

سەرێ خۆ وێ شووڕكرى
وەكى گايێ بن گێرێ

من گو[2] ئەڤە ج كەسە
گو[3] ئەڤە مەلا ...... رە[4]

ل سەر سەرێ فەقيا
گەلەك ب گەف و هنەرە

---

[1] ل جهەكێ ديتر: هاتم.

[2] من گۆت.

[3] گۆت.

[4] ناڤ هاتيە پاراستن.

پاشـــــى بـــــەرێ خــــۆ ددەمـــــێ

عـــەينـــەن[١] وەكـــى شـــەيطـــانى

كيــــرێ خــــۆ گـــرت و قرانــــد

هــــەر دوو دەســـــت ل ســــەر دانـــــى

مگــــــو[٢] ...... [٣] ئـــــەو چييــــه

گـــــو[٤] چنكـــــى وێ ژن نــــانى

مگـــو[٥] كـــەســـەك تـــەنـــا كـــت

تــــو زۆر پيســــــى وەك كـــــەرى

ئــــــەگـــــەر تـــــه ژن دڤێــــتن

تــــو ماركــــه پيـــــره كـــــەرى

دێ و ڤـــــێ وێ بــــۆ خــــۆ ڕاكـــه

دا ســـــەر لـــــێ ب هــــــەژينــــــى

تـــــه كيـــــر چيڤـــــێ گاڤانــــا

تــــــو دێ كـــــــەرى درينـــــــى

تـــــه ئـــــاڤ وەك ژەهـــــره مــــاره

ددانــــــــا لێــــــــت وەرينــــــــى

مـــــا ئـــــەگـــــەر ماكـــــەر نـــەبـــت

دێ چـــــــاوا بتــــــــه بــــــــت ڕازى

چنكـــــــى تـــــووى مـــــەلعـــــوونى

---

[١] وەكى، مينا.

[٢] ل جهەكێ ديتر: من گو(من گۆت).

[٣] ناڤ هاتيه پاراستن.

[٤] من گۆت.

[٥] من گۆت.

تـــووی برســـــیێ تـــووی گـــازی

نـــێ نــــه ئـــەز بـــاش تـــه دناســـم

دائـــــیم نـــــه ســــــەرفـــــەرازی

وەڵلاهــــــــ تـــــــووی گـــــــەوادی

بـــۆ فـــــەســـــادێ تـــووی شـــازی[1]

طـــــەبعـــــێ وه هــــــەمـــــی کـــــوڕا

هــــــەر دەم فـــــەســــــاد دڤێـــــــتن

ژبــــــۆ مــــــه ئـــــەهلـــــێ عیلمـــــی

هــــــوین ئـــــاگر و هــــــوین پێـــــتن

ئـــــــەزا تـــــــه صــــــــەکتیــــــنم

هــــــەکـــــه مـــــن جـــــەور[2] بڤێـــــتن

ئـــــەمـــــا ئـــــەز قـــــەط وه نـــــا کـــــم

چنکــــــــی ئـــــــەزێ حــــــــەلیــــــنم

ل دور مــــــــافێ فـــــــــەقیــــــــرا

گــــــەلـــــەك حــــــەدیثـــــا[3] دبیـــــنم

هــــەکـــــەر تــــــو ژ ڤیـــــرێ نـــــەچـــــی

ئـــــــەز ل ڤێــــــــرێ نــــــــامینم

مـــــــن هیڤـــــــی ئـــــــەوه بچـــــــی

هــــــێش مـــــــن دەینــــــــه کـــــــری

هــــــەکـــــــه تـــــــو بێــــــژی نـــــاچم

دێ دەســـــــــت دم دەســـــــــت بڤـــــــری

---

[1] تەکی.

[2] ستەم.

[3] فەرموودە.

ئەزێ وەصا بتە دادم[1]
هەر وەکی کەرێ مری
بێهنا من ئەول فرەهە
بەلێ پاشی ئاگرم
ئەگەر کەربا مقەبت[2]
ئەز گوبز د ڤەکرم
دەینم سەرێ نەیاری
نێ ئەز خودان هنرم
بەلێ تو بەرناکەڤی
چنکی تووی کورەی
یا دی کەس تە نا ناست
ئێتیمەك بێ توێتەی
دائیم تو یێل کولانا
عەینەن[3] هەر وەکی صەی
ئەڤە ئاخر مگۆت[4] تە
دا تو ژ ڤێرێ بچی
ئەگەر تو ژ ڤێرێ نەچی
دێ وەك ژهێ قوڕمچی
دێ تە ل کولانێ پانکم[5]

---

(1) دانمەتە، تە قۆتم.

(2) من ڤەبت.

(3) وەکی، مینا.

(4) من گۆت.

(5) پەحنکەم، ڕاستی عەردی کەم

وەكـــــى گـــــويێ زرڤچـــــى[1]
ئـــەگـــەر تـــو مـــن نـــەناســـى
بزانــــە ئـــــەز نــــورەدديـــــنم
بــــۆ فــــەقيـــــر و هـــــەژارا
خـــــوادان ڕەحــــم و يـــــەقيـــنم
بـــەلـــێ بـــۆ يـــێ وەكـــى تـــە
ئــــــەز چـــــاڤێ وا دڕيـــــــنم

(1) پرچقى.

# ئاخفتن دگەل چەرخی

ژ دەستێ چەرخێ دائیم ئەم دنالین[1]
حەتا گەنگی مەد ئێخی[2] دەستێ پیسا
ئەڤە چەند[3] چاخە ئەم بەندە و ڕەزیلین
نهۆ[4] تە ئەم فرۆتین جارێ دیسا
ئەڤە زۆرداریە چەرخێ بزانە
تو نابینێ یەتیم برسی و ڕویسا

گەلۆ ما تو شەرم ناکێ ژ یەزدان
هەتا گەنگی تو دێ دەینێ مە دەربان
خراب[5] کرنە ب هەزارا ماڵ و خێزان
بەسە بۆ نا خودێ نینە تە وجدان
ژ دەستێ تە ئەمین هەر ماڵ وێران
تە ئەم خستین کۆنا هەر وەکی جوردان

تە ئەم خستینە گەلی و کۆهـ[6] و چالە
ئەمین هەردەم دژین د بنکێ نهالە
ئەمین قووت و ئەمین ڕووت وەك ڕەوالە
تە ئەزمانێ مە بەست[1] ئەم کرنە لالە

---

[1] ل جهەکێ دیتر: ئەز دنالم.

[2] ل جهەکێ دیتر: مەت ئێخی.

[3] ل جهەکێ دیتر: چەن.

[4] ل جهەکێ دیتر: نوهۆ.

[5] ل جهەکێ دیتر: خەڕاب.

[6] (کوهـ) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (چیا) ددەت.

سـەپـانین ئـەم ژیـۆ خـەلکـێ ئـۆ پالـە
بـەسـە ئـەی ڕوورەشـێ نـێ ئـەڤ نـە حالـە

ئـەرێ مـا هێـژ تـو دێ، دێ مـە نـەخۆشـی
دگـەل پیسـا ب زەوق و ب خرۆشـی[٢]
ل سـەر تـەرمـێ[٣] مـە هـەردەم تـو ب جۆشـی
دگـەل نـەحسـێ مـە هـەر نـەخبـەی دنۆشـێ[٤]
گـەلـۆ مـا هێـژ تـو دێ هـەر مـە ڤـەپۆشـی[٥]
ل هـەمـی بـازارا بزانـە نـێ تـو[٦] فرۆشـی

فـەلـەك هـەر تـف ل سـەر تـە تـو نـەباشـی
دبـن قـەوادا وەك مسـعار[٧] و ئاشـی
تـو سـمبێلا ل مـە کـوردا د تـەڕاشـی[٨]
یـەقـین بـۆ مـە هـەژارا هـەر تـو جاشـی
ژبلـی کـوردا لـبن[٩] هـەر کـەس بـەلاشـی
ب ڤـێ هـزرێ بزانـە نـێ تـو شاشـی

ئـەوێ بـەرسـڤ ل مـن دا گـۆ[١٠] بزانـە
کـو دونیـا هـەر وەکـی سـویك و دکانـە

---

(١) گرت.

(٢) ل جهەکێ دیتر: خۆڕوش.

(٣) ل جهەکێ دیتر: گەڕمێ.

(٤) (دنۆشی) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (ڤەخوارن) ددەت.

(٥) (ڤەپوش، وەپوش) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (بەرخوەکرن) ددەت.

(٦) دێ هەر مە.

(٧) زڤڕین.

(٨) ل جهەکێ دیتر: طەڕاشی.

(٩) ل جهەکێ دینر: دبن.

(١٠) گۆت.

وەرن بـــــازارى نـــــێ تشـــــت ب بهانـــــە
ئـــەو دێ ســـوودێ ژ وێ كـــت ئـــەوێ زانـــە[1]
نـە ئــەو كــەس وەك وە كــوردا كــو نــەزانــە
ئـــەڤـــێ هـــزرێ تـــو بـــا ڤێـــژە و تـــو دانـــە[2]

ئـــە[3] ناهــــێلم ســـووار بـــن پـــيس و جاهـــل
نـــە وان هــــزر نـــەوان هـــۆش و نـــەئاقـــل
هـــەمـــى گاڤـــا نـــە ئێـكـــاتى[4] و نـــە يـــەك دل
نـــەيـــار بـــن ئـــەو ژبـــۆ يـــەكتـــر ژ يـــەك ســـل
كـــەڕ و لالـــن ژ دەســـت و پاهـــا[5] ئـــەو شـــل
شـــەڤ و ڕۆژا نـــەســـاخن ئـــەو دبـــن جـــل

گـــەمانـــە[6] هـــوين ژبـــۆ دينـــار و دەرهـــەم
د فرۆشـــن هـــوين و وەلاتـــى بـــۆ خـــۆ هـــەردەم
وە دلخۆشـــە ب[7] پـــارە و دل وە بـــێ غـــەم
ژبـــۆ وە كـــۆم بـــوو ســـامان و بـــەرهـــەم
ســـەپـــانن بـــۆ نـــەيـــارى هـــوون هـــەر ل جـــەم
چـو[8] كـەس وەك وە نـەزان قـەط[9] مـن نـەديـدەم[10]

---

[1] ل جهەكێ ديتر: ئەوێ سوودێ ژ وێ كت يێ كو زانە.

[2] (دانە) پەيڤەكا فارسيە و ڕامانا (زانا) ددەت.

[3] ئەز.

[4] نەئێكگرتن، نەهەڤگرتن.

[5] (پاها) پەيڤەكا فارسيە و ڕامانا (پێ) ددەت.

[6] تەماع؛ ل جهەكێ ديتر: نەمانە.

[7] ل جهەكێ ديتر: بو.

[8] ل جهەكێ ديتر: چ.

[9] ل جهەكێ ديتر: قەت.

[10] (نەديدەم) پەيڤەكا فارسيە و ڕامانا (من نەديتيە) ددەت.

## ئەی گەل

ئەی گەلێ من تو خیالی
چاخێ شەوگاها د نەوەم
ئەز نەدلخۆش و نەباشم
چنکی تو دیل[1] و ڕەبەن
دەستەکی پیس و چەپەڵ
دانایە سەر گیان و بەدەن
صەد نهال تێنە دلێ من
هەر جهێ ئەز لێ ب لڤم

ئەی گەلێ پێشان جهێ
شێر و پلنگ بەڤلە شێر
وەك بەهشتێ هەر بخۆشی
دائیمەن تێر خێر و بێر
پڕ ل میر و بەگلەرا[2]
خاتوون و خانم پێکڤە مێر
پەردەیەك ڕەش هاتە سەر تە
لەو ژیۆ دئاخڤم

ئەی گەلێ کەڤینە بن
بارێ گران و مەئتەمە[1]

---

(١) ئێخسیر.

(٢) پەیڤەکا مەغولیە و ڕامانا (مەزن، و ئاغا و خان و ...) ددەت.

پێکڤە ئەم بوونە گەدا[٢] و
دڵ بۆ وە بەحرا خەمە
ئەڤ جهێ هەر وەك بەهشت
ئەڤرۆ هەر وەك جەهنەمە
ئەز ل تو راتە ل نك ڤان
زاڵما بێ بەرسڤم

چەرخێ گەردوون ئەڤرۆ ئەم
داینایین و ئەو برنە سەری
تف ل چەرخێ بت چ گوهـ
لووتە ژێ دەنگێ کەری
پشت دبەستت ئەو ب پیسا
هەم مرۆڤێ سەر سەری
لەو نە دلخۆشم ب رۆژێ
هەم ب شەڤ ئەز نانڤم

خۆزیا جارەك من بدیتا
ئەڤ گەلە رزگار بیا
ئەم بلاڤ بوونە ب زۆرا
نوو سەرێ کوهـ[٣] و چیا
مللەتێ من جارەکا دی
کەتبا خێر و خۆشیا
دا ل سەرێ دیلانێ هەردەم

---

(١) گری و شینی.

(٢) خوازۆك.

(٣) (کوهـ) پەیڤەکا فارسیە و رامانا (چیا) ددەت.

ئەز ژ کەیڤا ڤەلقم

سندی و هەردەم ئومێد
دارێ ژ یەزدانێ مەزن
چەرخێ گەردون کو ببت
مەرکەب ژبۆ مە و ل سەربەزن
جارەکا دی ئەم ل پێش
نەیارێ زۆردار نەبەزن
وی دەمی بێ طڕس و خۆشی
دێ ژبۆ خۆ تێر نقم

# ئیمپریالیزم[۱]

ئیمپریـــــالیزم بـــــۆ خـــــۆ هشـــــیاره
ژبـــۆ مللــــەتــا هـــەر ئـــەو نـــەیـــاره
بـۆ کـەسێ چـو جـار ناکیـت چـو چـاره
ل ســـەر مللـــەتـــا نـــێ هـــەر ســـویاره

قـەط[۲] نـە مومکنـە[۳] سودەك[٤] تـەژ بـت
ئـەمـت دانیشـین[٥] ئومێـد مـە پـێ بـت
خـەریکـە[٦] هـەر دەم خـەلکێ ژ ڕێ بـت
قـە دیتـە شـەیطـان هـەڤـالێ کـێ بـت

ســـەرێ نـــەوەوی ئـــەوێ چێکـــرن
ســـینۆر[۷] و وەلات هـــەمـــی ژ مـــە بـــرن
دبـــن دەســـتێ وان ئـــەم برســـی مـــرن
دەخلـــێ مـــە چانـــدی ئـــەو بـــۆ خـــۆ بـــرن

---

[۱] ئیستیعمار.
[۲] ل جهەکێ دیتر: قەت.
[۳] نە باوەرە.
[٤] پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (قازانج) ددەت.
[٥] ڕوینن.
[٦] مژویلە.
[۷] ل جهەکێ دیتر: سنۆر.

طـــۆپ و دەبابـــە وان دانـــە شـــۆلی
عـــەدرێ مـــە سـۆت ۆ ل مـــە کـــر خـــولی
هــــەڕشـــان کلـــوخ[١] وان ب ماهـــولی[٢]
هـــەتـــا قیامـــەت دێ مـــە دن شـــۆلی

طـــەیـــارە و صـــاڕۆخ وێ د گـڕگـــڕینن
بومبـایێ حـەف[٣] طـەن[٤] وێ ل مـە دفڕینن
دل و مێلاکـــــا وێ ل مــــــە د دڕیـــــنن
عـــەشـــیر و عـــێلا وێ ل مـــە دبـــڕینن

ئسطـــۆلێ[٥] گـــران ئێخســـتە ئـــاڤێ
بـۆ خـۆ پـێ دکـت ئـەو سـەیـد[٦] و ڕاڤـێ
دا پـــێ بگـــرن ڕۆژهـــەلات نـــاڤێ
خۆلبـــەر مـــە ڤـــەدا هـــەردەم و گـــاڤێ

تـــوزا ئیبـــادێ[٧] ئـــەوان چێکـــرن
ب ملیونـــا عالـــەم ب وێ ئـــەو مـــرن
چـــی دەرا ڤیـــا بـــۆ خـــۆ پـــێ دکـــرن
هێـــژا دبێـــژن ئـــەم نـــە کـــافرن

---

(١) سەرێ مرۆڤان، دەمێ دبێژن: کلۆخێ سەری.

(٢) ئامیرەکە بەرا پێ دشکێنن.

(٣) حەفت.

(٤) تەن بەرامبەر هزار کێلویانە.

(٥) کۆمەکا گەمیێن جەنگی.

(٦) صەید (نێچیر).

(٧) ژناڤبرنێ.

رۆس و ئـــەمریکـــان وەکـــی شـــەیطـــانی
فـــەڕەنســـا و ئینگلیـــز دگـــەل ئـــەڵمـــانی
هـــەردەم خـــەریکـــن ب گـــەلـــێ خـــەلکـــی
چ دەرا شـــیان دەســـت ل ســـەر دانـــی

هێـــژا دبێـــژن ئـــــەم ب مـــــرۆوەتـــین
دگـــەل شـــعوبا[1] ئـــەم ب عـــەدالـــەتـــین
لـــەوا دبیـــنن ئـــەم ب ســـەرکـــەتـــین

---

[1] شەعب (مللەت)، شعوب (مللەتان).

# کورد

کورد چو جار ناچیته دامێ
بو بیانیا نۆکەره[1]
ئەو گەلەك پیسن ژیۆ یەك
مللەتێ خۆلیسەره
دائیمەن[2] پێکڤە خەریکن[3]
دا ل ناڤ بڕ یەك ببن
صەد هزار داخ ل دلێ من
قیبلەتا وان عانەیە[4]
ئێکەتی و علم و زانین
قەط[5] ل نك وان ئەو نەهن
مێرینی و کۆشتن ل نك وان
تشتەکێ ئاسانەیە
بۆ طڕ[6] و پفدانێ باشن
ئەو دبێژن هەر ئەمین
ما کوردەواری خوارنە
یان گۆتنێت دوڕیانەیە

---

(١) (نۆکەر) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (خۆلام) ددەت.

(٢) هەردەم.

(٣) مژۆیلن ژ زاراڤێ سوڕانی هاتیە وەرگرتن.

(٤) پارە.

(٥) ل جهەکێ دیتر: قەت.

(٦) تڕ.

قەومەكێ بێ علم و ئەخلاق
چاوا دا سەربەست ببن
ئەز دینم ل هەر دەمە
ئەو نۆكەرێ بێگانەیە[١]

گەر گەلێ كوردی بڤێتن
بێتە ڕێزا مللەتان
با بخوینن ئەو برا بن
بۆ وان هەر ئەڤ جارەیە

بەسە جەحش و ما شەرم ناكێ
كەرینی زەحمەتە
دائیمەن[٢] كورتان ل سەر تە
خۆش كەرێ بن بارەیە

ما تو نابینی گەلێ ڤێ عالەمێ
تەم ڕاپەرین
بوونە دەولەت یەك ب یەك
كوردو تنێ بێ چارەیە

كەس نەما بۆ خۆ كو حنگەك[٣]
هەر ل ڤێ دونیایێ نەدا
كورد تنێ پیس و ڕەزیلە
دل كول و دێوانەیە[١]

---

[١] (بیانی) ژ زاراڤێ سوڕانی هاتیە وەرگرتن.

[٢] هەردەم.

[٣] دەربەك.

ئـــــــەز دزانـــــــــــم دەردێ وە
ئـــەی کوردینـــو گۆهـــ لـــێ ڤـــەدن
زانــــــــین و علـــــــم و تفـــــاق و
دەســـــــت ب دەســـــت دەرمانـــــەیــــــە

---

[١] (دیوانە) پەیڤەکا فارسیە و رامانا (دین، شێت) ددەت.

## هزرا داوەتێ

مە هزرە ئەم بکین داوەت
کو بویکێ[1] ئەم بگوهێزین زوو
هەمی لاو خۆ هەلاڤێژن
نەکو هەر یەك ژ وان بۆ خوو

ب شێخانی هەمی پێکڤە
ب دنانی خۆ ب حەلینن هەر
بەر و پشت و چەپ و ڕاستا
کو لێبدن گەهـ بکن هوو هوو

وەکی ڤێ بویکێ قەط[2] نینە
دەلال بت ئەو ل دونیایێ[3]
شەهنشاها دەلالانە
ژ لەو عەقلێ مەلا وا چوو

چ بێژم بۆ تە ئەی حافظ
دناسی تو ئەڤێ جانێ
زەلالترە ژ هەیڤا چاردە
هەر دەم ئەو ب ڕەنگ و ڕوو

---

(1) ل جهەکی دیتر: بووکێ.

(2) ل جهەکێ دیتر: قەت.

(3) ل جهەکی دیتر: ل دونیایێ دەلال بت ئەو.

ل سەرێ وێ تاجەكا زێڕین
ل ناڤ طەنگی[1] چ هەمیانە
چ خرخالێن دلنگادا
هەمی دوڕ و جەواهر چوو

وەكی من باشی دناسێ ئەنو
وەڕێ مائی كو ئەڤ جانە
بەلێ[2] كۆڤان ژبۆ وی ئەو
ژناڤ مە بەر بۆ یان زوو چوو

د طرسم[3] ئەز بچم نك وی
نە كم داوەت دگەل لاوان
سەبەب ماموی ئیرۆ ل مە
كو وەختێ داوەتێ دێر بوو

مە پەیمانە هەمی لاوا
بكین دیلان ب هەر جۆرەك
ب گوهێزین سەروەرا جانا
هەكەر خوین ژ مە ببت جوو جوو

كچا مامێ یە چێنا بت
بیانی بۆ خۆ بسطینن[4]
هزار كەس هاتن و خوەستن
ب[1] جانێ نە گۆت وان[2] ئوو

---

(1) ل جهەكی دیتر: تەنگێ.

(2) ل جهەكی دیتر: ب.

(3) ل جهەكێ دیتر: نە ترسان.

(4) بستینن.

کــو چــاڤ نێــرا مــه پصــماما[٣]
ب دلــــێ کۆڤـــان و دامـــائی[٤]
نــهخــوازین یـــان نـــه دیــل کــین
ئــهو کــو چــهنــد صــالٚتر بمینــت هــوو

کچـــا کـــوردا بزانــــه بـــاش
ب پســـــمام[٥] و مرۆڤــــێ تــــوو
نــهشــێن[٦] هــیچ کــهس ل دونیــایێ
حــهســاب کــت تــه ژ بوونـــا خـــوو

تـــو کوردســـــتانا کـــــوردانی
کـــو تاجـــا شاهــــی شاهـــانی
ل نـــاڤ جیهـــان تـــو ســـولٚطانی[٧]
نـــهیـــێن وهك تـــه ب ڕهنـــگ و ڕوو

ئـــهرێ ســـندی تـــو بێـــژه هـــهر
بژیـــــت کــــورد و کوردســــتان
ب ســـــهربــــهســـــتی و ئــــازادی
وه ڕزگـــار[٨] بـــت نـــهمینـــت هـــوو

---

[١] ل جههکی دیتر: بهلێ.

[٢] ل جههکی دیتر: وا.

[٣] پسماما.

[٤] ل جههکی دیتر: دامایی.

[٥] ل جههکی دیتر: پصمام.

[٦] ل جههکی دیتر: نهشێت.

[٧] ل جههکی دیتر: سولٚتانی.

[٨] ل جههکێ دیتر: ڕیزگار.

## شۆڕەش[1]

هـــزار و نـــەهـــ ســـەد و شێســـتێ[2]
ل كوردســـــتان بـــۆ وە شـــۆڕەش
ژ هـــەیڤـــا یـــازدەئـــێ پێڤـــە[3]
ل هـــەمـــی عـــەردا بیـــە هـــەی هـــۆ

جیهـــان پـــارێزە هـــەمـــی ڕابـــین
بپـــــارێزن جیهـــــانێ خـــــۆ
بـــــەرامبـــــەر دوژمنـــــی پێكڤـــــە
گـــو ڕاوەســـــتن كـــۆرێن كـــوردۆ

بـــەلـــێ چـــبكم گـــەلـــەك نۆكـــەر
بـــەزیـــن نـــاڤ حوكمـــەتـــی پیســـی
گوهـــــۆڕین دیـــــن و ناموســـــا
خـــو دا ب پـــارێ كـــورێ قاســـۆ[4]

ڕژێمـــــا وی دگـــــەل جاشـــــا
پـــەلامـــار دایـــە ســـەر كـــوردا
بنـــــاڤێ دیـــــن و قـــــانوونێ
چ وێـــران كـــر وەلاتـــێ خـــۆ

---

[1] شۆڕەشا ئەیلولێ ل سالا (١٩٦١)ێ، ب ڕێبەریا مەلا مستەفا بارزانی دەستپێكر و ل سالا (١٩٧٥)ێ ب داوی هات.

[2] شۆڕەشا ئەیلولێ ل سالا (١٩٦١)ێ، هاتیەكرن.

[3] ١١ ئەیلولێ.

[4] عەبدولكەریم قاسم، هەر ژ (١٤ تەمموزا ١٩٥٨)ێ هەتا (٨ شوبباتێ ١٩٦٣)ێ، حوكمڕانێ عیراقێ بوو.

چ دینه یان چ قانوونه
حەلال کت مال و نامووسه
برایێ وه موسۆلمانن
هەمی شێرن کۆرێت کوردۆ

ئەرێ ما هوین شەرم نا کن
گەلی جاشا ل دۆنیایێ
ڕوییێ وه صەد هزار جاران
کۆ ڕەش بت هەر وەکی قیرۆ

ب چ سەهیون[1] ژی بوون دەولەت
ب دل سۆزی و ئێکەتی
وه نینه غیرەتا ناحۆم[2] و
یاسا سوون و ئێلیاهۆ

فرۆتن وه دین و نامووسا خۆ
دا ب پاره و ژنی قەحبه
دبێژن هوین صلح نابت
عێراق هەر دێ بمینت هۆ

بەسه ئەی صم خرێت گوهـ شوور
نەبن نۆکەر ژبۆ خەلکێ
بێهلن ئاخوور[3] و گۆڤا
نەخۆن ئێتر چو کاو و جۆ

---

(1) صەهیون، جوهی.

(2) ئێك ژ پێغەمبەرێن جوهیان بوو.

(3) جهێ ڕاگرتنا دەواران ب تایبەتی هەسپان.

عــــەفـــوو دا بـــۆ وە شـــێری صـــۆر
ســـــەرۆك و بـــابێ مــــەســــعوودی[1]
بزڤــــــڕن نـــــاڤ وەڵاتـــــــی ب
خێـــر و خۆشـــی هـــوین نـــەمیـــنن هـــۆ

چ دلســــــــۆزە ژبـــــــۆ کـــــــوردا
هـــــەمـــی چاخـــا ئـــەڤـــێ ســـندی
دڤێـــت هـــوین تـــم بـــبن یـــەك دەســـت
نـــــە هــــەر یــــەك ژ وە ژبوونـــــا خـــــۆ

(1) مەلا مستەفا بارزانی ل (١٤ ئادارا ١٩٠٣)ێ، ل گوندێ بارزان هاتیە سەر دونیایێ ب ناڤدارترین و مەزنترین ڕێبەرێ تەڤگەرا ئازادیخوازا کورد دهێتە هژمارتن، گرنگترین خال د ژیانا بارزانیدا چوون و زڤڕینا وی ژ ڕووسیا (١٩٤٦-١٩٥٨)ێ، و ڕێبەریا شۆڕەشا ئەیلولێ (١٩٦١-١٩٧٥)ێ بوو، ل سالا (١٩٧٩) مالئاڤایی کر.

## دوڕا یەتیم

تــو دۆڕا یــەتیمــێ ل دەســتێ نــەزانــی
تــو شــەهــزادەیــا هــەمــی شاهــانی
تــو گــۆل نــەخۆینــا ل نــاڤ باغــانی
گــەر بــێ فــرۆتن ڕوحــێ دێ پــێ دیــن

تــو خــوەشیا مــە یــێ دە خــوە هشیارکە
دێ تــە خــەملیــنن دە ســەری ڕاکــە
داتــە بگــۆهێزین تــو خــوە پــێ شــاکە
ئــە شاهــێ شاهــا هــەر ب ئومێــدین

مــە دبــەر تــەدا دان ب هــزارا جــەحێــل
مــە خڕابکــرن ب صــەدا گۆنــد و عێــل
ئیــرۆ مــە نــەمانــە هێــز و نــە حێــل[1]
بــلا مــە هــەمیــا دبــەنــدێ گــرێ دیــن

تــو وا هێژایــی ســەرۆکــێ جانــا
تــو بــەر دکــەڤــی ئــەی تــاجێ خانــا
هنــدی ئــەم بــدین بــۆ تــە قوربانــا
هێــزا ئــەو کێمــە دێ زێــدە پــێ دیــن

پســمام بــەلاڤــن ل هــەمــی عــەردا
ئیــرۆ ئــەم دیلــین[1] ل دەســتێ نــەمــەردا

---

[1] شیان.

ئـــەو وا دزانـــن دەســـت مـــە ژتـــە بـــەردا
نـێ قـەط[۲] وە نینـە سـۆندێ بخـۆدێ دیـن

دەمـــا ڕۆژ هـــەلآت ل مـــە بـــت بهـــار
بـــەفـر بحـــەلیـت شـین ڤـەبـن شـینوار
مـــە پـــەیـدا بـــبن دیســـان دوســـت و یـــار
ل بـــەژنـا پســـاما چـــەکـا گـرێ دیـــن

دێ تـــە خـــەملینـــین ب هـــەمـــی ڕەنگـــا
نـــارینکێ بێـــژین ب ئـــاواز و دەنگـــا
ئـــەم دێ لـــەیـــزن ب تـــایو چـــەنگـــا
دیلانـــێ خـــۆ کـــەیـــن شاباشـــا دێ دیـــن

توقـــا ســـتوێ تـــە هـــەولێـــر و کـــەرکـۆك
زاخـــۆ و ڕەوانـــدز دگـــەل وا دهـــۆك
ســـەقـــز و شـــنو شـــارێ ســـێ مـــەکـۆك
بـــازنێ دەســـتا نـــەدێ ل زنـــدێ وێ دیـــن

جـــەزیـــرە و ئامێـــدی و ســـۆلەیمـــانی
مـــەهابـــاد و دیلمـــان بـــانێ
دیاربـــەکـــر و شـــەمـــدین و وانـــێ
نـــاچن پـــێ خـــەملـێ دێ ل ســـەرێ وێ دیـــن

هـــەلگـۆرد و طـــەنـــین ژیـــۆ تـــە کـــەمـــەر
ســـیپان و کـــاتو نـــەقشـــن ئـــەو ل ســـەر
هندرینـــە مـــەنتـــەش کێـــوە ڕەش ل بـــەر
هـــەیبـــەت سـۆلتان بـــت پرپـــر کـولێ دیـــن

---

[۱] ئێخسیرین.

[۲] ل جهەکێ دیتر: قەت.

هەرە گۆلێ میرا خامتوور و مەتین
زۆزك و پێرس دگەل وان شرین
جەبەلول ئەكراد و قەرچوخ و حەمرین
تیتا زێرانە دێ ل سەرێ وی دین

عەین تابو قەرص و بازید و سنجار
پالو و یەریڤان دگەل ئەسكی شار
ئوصطوخور[١] و خورەم شارێ چاربازار
حوچولێ لنگا دێ ل سەری صولێ دین

دێ ڕابنە سەرخوە ئەی گەلی كوردا
پێكڤە هەو بدن ئەی گەلی مەردا
ژ سەر دلی ڕاكن گوڤان و دەردا
ب هزارا ئەم دێ قۆربانا لێ دین

ما شەرم نینە ئەم هەر بەندە بین
ژ هەمی دونیایێ ئەم بیهودە[٢] بین
ل دەستێ نەیاری ئەم بێ چارەبین
وەكی پەپۆكا ل سەر ڕێلا لێ دین

سەبەب هەر ئەڤە ئەم بێ تفاقین[٣]
ئەم زۆر دوو ڕوینە و ئەم ب نفاقین[٤]
دائیم[٥] ل گەل یەك ئەم ب شیقاقین[٦]
دێ كوردستانێ ب دەستێ خەلكێ دین

---

[١] ئستەخر.

[٢] (بیهودە) پەیڤەكا فارسیە و ڕامانا (بێ مفا، بێ قازانج، بێ بەرهەم و...) ددەت.

[٣] نەئێكگرتی، نەهەڤگرتی.

[٤] دوو ڕوی.

[٥] هەردەم.

[٦] نەل گەل ئێكن.

سندی هەر دەمێ ئەو هزر دارە
کورد ڕزکار[1] ببن ژ دەستێ نەیارە
یێ هزرێ نەکت ئەو بێ عارە
صوندم[2] ب یەزدان ئەمێ ڵ ڤێ دنێ چین

---

[1] ل جهەکێ دیتر: ڕێزگار.

[2] سویندم.

## نیشتمان[1]

ڤی دەمێ من چاڤ ل دیدارا شرینانە وەطەن
دائیمەن هاورێ[2] ل گەل غەم هەر دەمێ جەور[3] و میحەن[4]
بل ژ ئاخا ڤی گەلی نێ ئەو کلە بۆ چاڤێ کول
ئاڤ و ڕووبار و کەهنی[5] شەربەتا جان و بەدەن
حوببا[6] کوردستانێ ئەو جوزئەك[7] ژ ئیمانا مەیە
بیر و فیکرا[8] ئاڤ و ئاخ و ویرد و زکرێ من وەطەن[9]
ژ بەرهەمێ توخمێ گۆلا تو بووی جهێ قومری و هزار
ئەڤرۆ تو هێلین ژبۆ گوند و قڕین ڕەش ئەی ڕەبەن
گوند و باجار[10] و هەمی جە پێکڤە وێران و خڕاپ
ملك و شوین دەوست هەمی هەر خالی بوونە بۆ سەکەن[11]

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٦)ێ هاتیە نڤیسین.

[2] هەڤال و دوست، ژ زاراڤێ سورانی هاتیە وەرگرن،

[3] ستەم.

[4] تەنگاڤی.

[5] کانی.

[6] ئەڤین، ڤیان.

[7] پارچەیەك، پشکەك.

[8] ل جهەکێ دیتر: فکرا.

[9] وەتەن، وەڵات، نیشتیمان.

[10] باژێر.

[11] جهوار.

سەر چیا و دەشت و كولان نێ ب خۆینێ گۆل گۆلین

پێكڤە وێران و خراپن داخ و كۆڤان بۆ وەطەن

جیێ[(١)] ئیمام و واعظا[(٢)] جیێ[(٣)] دین و ئیسلام و علۆم

بوویە جیێ بۆ دوژمنێ ئینسان و دینی لێ دەرەن

مینبەر و مزگەوت و حوجرە هەم كەنیسە و مەقبەرە

وا بناغێ وان نەهێلان پێكڤە ئەو وێران كەرەن

بین جهێ مەیخانەئێ ئو قەحبە و قومار و پیسیێ

بوونە ئێخسیر و ب هزاران بۆ جنووبی[(٤)] ئەو بەرەن

وان ل مە كوشتن جەحێل و جانە مەرگێن پڕ دەلال

وان هەموو بن ئاخ كرن بێ شوار و بێ نقێژ و كەفەن

حەشرە وا هاوارە ئیرۆ هیرۆشیما هەر ئەمین

كوشتن و تالانكرن ئەو ئێن و ئێخسیرا دەبەن

كارەساتا هێروشیما یا مە كوردا حەلەبچە

چەند هزار یەك لەحظە[(٥)] مردن[(٦)] هەر ئەمین دیل[(٧)] و ڕەبەن

چار كەنارێ[(٨)] مە هەمی تم دوژمن و دوڕندەنە

عەین و عەین و تێ كۆ هەر سێ نە مرۆڤ و كەركەرەن

---

(١) ل جهەكێ دیتر: جێ.

(٢) بانگخواز.

(٣) ل جهەكێ دیتر: جێ.

(٤) باشوور.

(٥) دەم.

(٦) (مردن) پەیڤەكا فارسیە و ڕامانا (مرن) ددەت.

(٧) ئێخسیر.

(٨) ڕەخ، ئالی و لا؛ ل جهەكێ دیتر: كناری.

کورد گەلەك مات و ڕەزیلە کۆ ل نك سێ مللەتا[1]

سندی هێژ هند وەخت مایە بۆ خۆ ئەم فیکرێ بکەن

---

[1] عەرەب، فارس و تورك.

## بهارا مه هات

بهـــارا مـــه هـــات بـــهلــێ ئـــهم برســـی
كـــهســێ ژ مـــهزنـــا ل حـــالی نـــهپرســـی[١]

صـــالانی بـــووری باســـێ گـــۆلا بـــوو
كـــهیـــف و ســـهیـــران و دیتنـــا یـــارا بـــوو

قـــهب قـــهبـــا كـــهوا ل ســـهر چـــهل و بـــهره
زســـتانا نـــهخـــۆش مـــهر هـــهر وا ل ســـهره

ئـــهڤ صـــالـه[٢] گـیـــا و كـــهرەنـــگ بهانـــه
فـــــهقیـــرێ كـــوردا پـــاره نـــــهمانـــــه

هـــــهر زڤســـــتانه ل ســـــهر مـــــه كـــوردا
چنكـــی[٣] ســـهرۆكـــا دەســـت ژ مـــه بـــهردا

ئـــێش و ئـــهلـــهمـــا ل مـــه كـــوردا دەركـــر
هـــهر گـــاڤ دێ زانـــێ ئاهـــا[٤] فـــلان مـــر

ژیـــهر وێ چـــهنـــدێ ئـــهم فـــهریســـهنـــه
هـــهمـــی كـــهســێ ئیـرۆ ل ســهر تـــهرمـێ مـــهنـــه

---

(١) باسێ دەستپێكا سالا (١٩٩١)ێ وێڤه كو عیراق ب گشتی و كوردستان ب تایبەتی د ڕەوشەكا نەخوەشا ئابووری دا بوو.

(٢) سالێ.

(٣) ل جهەكێ دیتر: چونكی سەرۆكا.

(٤) ل جهەكێ دیتر: ئها.

بـــەلـــێ بولبـــولـێ ل ســـەرگـــۆلا دخوینـــت
نـــــەغامــــــا[١]زەبـــــوورا[٢]داوودی[٣]دئینــــــت

چنكـــی نزانـــت حـــالێ مـــە چـــی یـــە
ل نـك وی هـــەمـی كـەس هـــەر وەك وی یـــە

ل نـاڤ گـول و باغـا ب خێـر و خۆشـی یـە
نزانـــت حـــالێ مـــە كـــوردا چـــی یـــە

ژینـا وی خۆشـی و كـەیـف و سـەیـرانن[٤]
ئـــەم كـــورد ب كـــول و دەردو كۆڤـــانن[٥]

تێـــری ئاگـــەهـــش ئـــێ برســـی نینـــە
گۆتنـا مـن[٦] ب ڕاسـتی بـێ كـەرب و كینـە

شـێر و پڵنگـا كـەڵـەخ بـۆ خـۆ بـر
زۆلـم هـەر دوا ل هاوبـەشـێ[٧] خـۆ كـر

بــلا نــەرمــە گوشــت بـۆ هــەر دووا بــت
بــەلــێ هــن[٨] هـەسـتی بـۆ هاوبــەشـا بــت

دا ئـــــەو ژی بـــــژین ل ڤـــــێ دۆنیـــــایێ
خۆزیـــا گۆهـــ بـــدن بـــۆ ئـــەڤـــێ ڕایـــێ

---

[١] ئاواز.

[٢] پەرتووكا ئەسمانی ئەوا بو داوود پێغەمبەری (س) هاتی خوار.

[٣] داوود پێغەمبەر كوڕێ سولەیمان پیغەمبەر (س).

[٤] ل جهەكێ دیتر: سەیرانین.

[٥] ل جهەكێ دیتر: كۆڤانین.

[٦] ل جهەكێ دیتر: م.

[٧] پێكڤە.

[٨] ل جهەكێ دیتر: هند.

ئـــەمـــت[1] مـــەحـــرۆمین[2] ژ ڤـــێ بهـــارێ
ل مـــــە نـــــەیـــــارە دێـــوێ[3] مغـــــارێ[4]

ئـــای بـــۆ هێـــزەکـــێ دگـــەل نـــەیـــاری
وەك مـــــە دلســـــۆز بـــــێ دل برینـــــداری

دەســـتێ ئێـــك بگـــرین ڕوو بکـــەینـــە چیـــا
ئـــەم پێکڤـــە بگـــرین بـــۆ دیتنـــا ڕێیـــا

دا ئـــــەم ئـــازاد بـــین ژ هـــــەمـــــی زۆردارا
هـــەردەمـــێ ژ مـــە دچـــن ب ســـەد و هـــزارا

ســـەبـــەب ژی ئـــەڤـــە ئـــەم بـــێ تفـــاقین[5]
ئـــەم هـــەمـــی دگـــەڵ یـــەك هـــەر ب شـــیقاقین[6]

ئـــەڤ نـــەخۆشـــی یـــە کـــۆ پـــەنچـــەشـــێرە
ل جـــەرگـــێ کـــوردا هـــەر وا ڤـــەهێـــرە

ئـــــەمـــــێ ڕاپـــــارین ل بـــــەر یـــــەزدانـــــی
هـــــەر ئـــــەو بنێـــــرت بـــــۆ مـــــە دەرمـــــانی

کـــــول و برینـــــا ئـــــەو بکـــــەوینـــــت
کـــوردێ بـــێ تفـــاق لێـــك ڤـــە جـــەمینـــت

---

(1) ئەم د.

(2) ل جهەکێ دیتر: ئەم دێ بەشین.

(3) مروڤێن مەزن و هۆڤانە.

(4) شکەڤت.

(5) نە ئێکگرتی، نە هەڤگرتی.

(6) نە ل گەل ئێك.

تێر کت برسيا ژ ڕەحم و خەزينێ
خوداێ مەزن تو يێ[١] مە دبينێ

سندی دێ مرت ب ڤا[٢] کول و دەردا
چنکی مە کوردا دەست ژ خوە بەردا

---

[١] ل جهەکێ دیتر: وێ.

[٢] ل جهەکێ دیتر: ڤان.

## نەورۆز

ئـــەمـــێ دەســـتپێكین بنـــاڤێ یـــەزدانـــی

ســـەلامـــەك تـــازە ل ســـەر كوردســـتانێ

ل ســـەر وە هـــەمیـــا كومـــەلا شـــیرین

ل ســـەر مێهڤـــان و ئـــەڤـــێ دانـــانێ

زڤســـــتانا ڕەش ژ ســــــەرمـــــە ڕابـــــی

دیســـا بـــی دەمـــێ كـــەیـــف و ســـەیرانـــێ

گولصـــۆر و گولشـــەن ل ســـەرا پـــەقیـــان

پـــچ پـــچ[1] حـــەلیـــا بـــەفـــرا كیوســـتانێ[2]

هـــەلال و نـــەســـرین گـــەشـــبوون ل جـــەردان

قـــول ب قـــول كـــەتـــن مێرگـــێ زۆزانـــێ

وەڵات خـــــەملـــــی ژ هـــــەمـــــی ڕەنگـــــا

بولبـــولێ د[3] خوینـــت بـــەرێ بـــەیـــانێ[4]

بیشـــەنـــگ و كـــەڤـــوت دیســـا بشـــكڤتن

بـــی دەمـــی بـــەرخ و كـــارا و بـــەردانـــێ

كـــەو و كـــەودەری ل ســـەر بـــەرا دخـــوینن

قولنـــگ ڤـــەگـــەریـــا بـــەر بـــەحـــرا وانـــێ

---

(١) كێم كێم.

(٢) كویستان، زۆزان.

(٣) ت.

(٤) بەرێ سپێدێ.

هـــەرچ و وەشـــەگ و پلّنـــگ دەركـــەتـــن

كێـوڤی[1] ل ســەر شــاخا دكــن قوچــانێ

هـــەچـــی بڤێـــتن بچـــت بـــەهشـــتێ

بـــــلا بگــــەڕهـــــت ل كوردســــــتانێ

هـــەمـــی ملـلـــەتـــا جێژنـــێ خـــۆ هـــەنـــە

نـــەورۆز ژبـــۆ مـــە كــــاوەئـــی دانـــی

گوهــــدن چیرۆكـــێ دا بـــۆ وە بێـــژم

گـــوڕەی مێـــژوو وێ بڕاســـتی مـــە زانـــی

میـــرەك ســـتەمكـــار د چـــەرخـــێ پیشـــی

ل ســـەر مـــە كـــوردا حـــوكمێ خـــۆ زانـــی

دحــــــاكێ[2] زۆردار ڤیـــــا نـــــە هێلـــــت

مللــــەتـــێ كـــوردی بنــــاڤێ دەرمــــانی

هـــەرۆ دوو جـــەحێـــل ســـەری لێـــت بـــڕی

كلـــــوخ دشـــــكینا مـــــەژی دەرانـــــی

دووره گــــەهــــەشــــتە كــــاوەی ئاســـنگەر

ئێلچـــی چـــوون هـــەر دوو كـــوڕێ وی ئـــانی

ســـــەرێ بـــــڕی مـــــەژیـــــێ وان ڕاكــــــر

دەمـــێ كـــاوەیـــی ب ڤـــێ چـــەنـــدی زانـــی

هـــەڤـــال كـــۆمكرن ژ هـــەمـــی وەلاتـــان

ئـــاگرێ نـــەڤـــرۆزێ وێ شـــەڤـــێ دانـــی

دەشـــتا دا گـــورزێ خـــۆ ڤێریـــەك ڤـــەدا

پێشـــا هـــەڤـــالا بـــەیـــڕەق[1] هلانـــی

---

[1] كویڤی.

[2] زۆحاك.

وان پلامار[٢] بر خان و سەرایێ[٣]

سەرێ دوحاکی ژ مەلا هلانی

دلشاد بی مللەت ب کوشتنا وی

وا جەمشید ئانی ل شوینا وی دانی

نێ ژ وی چاخی هەتا ئەڤرۆکە

نەڤرۆز بۆ جێژنا[٤] مەیێ نیشتیمانی

ڕۆژا نەڤرۆزێ ب ڕەسمی بۆ عەید

ژبۆ مە کوردا ب شادومانی

بژیت براتیا کورد و عەرەبا

حەتا حەتایە ب کامەڕانی[٥]

صەد هزار ڕەحمەت ل گۆڕا بارزانی

ژبۆ مە کوردان وی بناغ دانی

بژیت مللەتێ کوردێ سەربەست

ب سەرۆکاتیا مەسعوود[٦] بارزانی[٧]

---

(١) ئالا.

(٢) هێرش.

(٣) کوچك، قەسر.

(٤) جەژنا.

(٥) کەیفخوەشی.

(٦) مەسعوود مستەفا بارزانی، سەرکرد و ڕێبەرێ گەلێ کورد، ڕۆلەکێ باش د هەر دوو شۆڕەشێن ئەیلول (١٩٦١-١٩٧٥)ێ، و گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨)ێ، دا هەبوو، د ناڤبەرا سالێن (٢٠٠٥-٢٠١٧)ێ، سەرۆك هەرێما کوردستانێ بوو، نوکە وەك مەرجەعێ سیاسیێ کوردان دهێتە هژمارتن.

(٧) ل جهەکێ دیتر: دگەل هەڤال و هۆگرێن ئەوی هەمیا پێکڤە و جەلال طالبانی

# کورد بوونە ئێک

سپاس بۆ یەزدان — کە کورد بوونە ئێک
وەصفا مە کوردان[١] — بیە ب ڕێک و پێک

هەر کوردەکێ باش — ئەڤە پێ خۆشە
گەلێ مەئی کوردی — نوهو ب جۆشە

هەر دوو سەرۆک[٢] مان — گەهشتنە ئێک
سۆڕا و بەهەدینا — هەر دوو بوونە ژێک

ئێ پێ نەخۆشبت — هەر وەکی هۆشە
بۆ برایەتی — دلمان ب جۆشە

بۆ ڤێ صولحا[٣] باش — ئەم سپاسدارین
هەر دوو سەرۆکا — ئەم بۆ دلدارین

ژبۆ ئەمرێ[٤] وان — کورد ئامادەنە
ل هەمی وەضعا[٥] — ئەم هەر ئەڤەمە

مەسعوود و جەلال[١] — باشە ئەو ئێک بن

---

(١) ل جهەکێ دیتر: کوردا.

(٢) مەسعوود بارزانی و جەلال تالًبانی.

(٣) ئاشتی.

(٤) فەرمان، دەستویر.

(٥) ڕەوش، کاودان.

هەمی شۆلێ مە    دێ[٢] رێك و پێك بن
ئێدی كەس نەشێت    مە ژێكڤە بكەت
هەتا هەتایە    كورد دێ ل گەل ئێك بت[٣]
نەیارێن چەپەل    وان[٤] هێڤی نەما
سەر ل وان سۆڕی[٥]    كەتنە بەر غەما
مە ئومێد نهۆ    جارێ نۆ ڤەبی
دەرگەهێ خێرێ    ل مە كوردا ڤەبی
بەلێ پێڤییە[٦]    ئەم ببین برا
ژبۆ طاریكی    ئەم ببین چرا
چنكی رێیا مە    یا ب دەحل و دڕرە
ب كۆڕەمار و    تژی هندڕرە
ڤێت ئەم خێرا[٧] بین    ژبۆ خەباتێ
دا ئەم ئاڤا كین    بورجێت كەلاتێ

---

[١] جەلال تاڵەبانی، ل ساڵا (١٩٣٣)ێ ژدایكبوویە، سیاسەتمدارێ كوردێ عیراقێ، ل ساڵا (١٩٧٦)ێ ئێكەتی نیشتیمانی كوردستان دامەزراند. پشتی كەڤتنا رژێما بەعس ل ساڵا (٢٠٠٣)ێ دناڤبەرا ساڵێن (٢٠٠٥- ٢٠١٤)ێ، سەرۆك كومارێ عیراقێ بوو. ل ساڵا (٢٠١٧)ێ وەغەر كر.

[٢] ل جهەكێ دیتر: دێب.

[٣] ل جهەكێ دیتر: هەر ب تفاقی كورد یێ چێت بت

[٤] ل جهەكێ دیتر: وی.

[٥] زڤری.

[٦] پێدڤیە.

[٧] بلەز، بەزگین.

دا ئاڤا ببت — جهێ باپیرا
دا ڕاکین بۆ خۆ — میر و وەزیرا

بلا هەر بژیت — کورد و کوردستان
بلا هەر[1] بمرت — نەیار و نەزان

سندی دلسۆزە — بۆ کوردستانێ
قەلەم ل دەستی — ل ڤێ مەیدانێ

[1] ل جهەکێ دیتر: هە دائیم.

## گۆفتوگۆ دگەل پێشمەرگێ ئەیلولێ

بوویە هەڤڕێ دگەل من جارە
کێ پێشمەرگێ ئەیلۆلێ

مدیت[١] ڕووترش ڤەڕسهایە
زەبون و زۆری مەهبۆلێ

مگۆتێ[٢] ڕوحەکەم[٣] بۆچی
ل ڤی حالی تو سەرخۆلێ

ل من دا بەرسڤ و گۆت و
دزانی مامێ سەیدا ئەم ڕەزیلین

ل دەستێ کاربدەست و کادرا دا
نە ڕێزگرتن زەبون ئەم مەلیلین[٤]

مگۆتی[٥] ما نە پەروەردە و
نە پێشمەرگێت[٦] سەرۆك و بابێ کوردا[٧]

ئەوی گۆت من بەلێ مامۆ
بەلان ڤانە نهۆ دەست ژ مە بەردا

---

[١] من دیت.

[٢] من گۆتێ.

[٣] ڕوحا من.

[٤] ل جهەکی دیتر: زۆر ئەم مەلیلین.

[٥] من گۆتێ.

[٦] ل جهەکێ دیتر: پێشمەرگێ.

[٧] مەبەست مەلا مستەفا بارزانی.

مگو[١] سوبحان ژ یەزدانێ مەزن[٢]

بۆچی ئەڤە هاتن گۆهوڕین[٣]

ئەوی گۆت مامێ سەیدا

بۆ طەماعا مال و مولیك و پارێ زێڕین[٤]

خەریكن[٥] ئەو نهو دا پڕ بكن

بانق و هەموو قاص و خەزینا

دبێژن هە[٦] ئۆمید بۆ مە

ل ڤی دونیائێ خۆشی و ڤەزینا

مگۆتێ[٧] ڕوحا مامێ خۆ بزانە

ما نابێژ ئە[٨] شەرمە ژبۆ مە

ب گوهێزن ئەم وەلات و گەل

ب پارە داكو سامان بت ژبۆ مە

ئەوی گۆت من نە مایە وان

چو شەرم و عەیب و وجدان

دەڤێ وان هەر بەشە و برسی

دونده نە دبینی مینا كودكان

---

[١] من گۆت.

[٢] ل جهەكێ دیتر: ئە سەرسوڕمام مگۆتێ.

[٣] ل جهەكێ دیتر: ئەڤ زۆر عەجێبە.

[٤] ل جهەكێ دیتر: بزانە نە ئەوان شەرم و نە دین و نە ئیمانە.

[٥] مژویلن.

[٦] هەر.

[٧] من گۆت.

[٨] ئەڤە.

فهێتکـــــارن وەڵات گـــــوڕین ب پـــــاره
بـــزانن بـــۆ مـــه کـــوردا ئـــەڤ نـــەیـــاره[١]
مگـــۆتی[٢] ئـــەڤ نـــەخۆشـــه پـــەنجـــەشـــێره
دنـاڤ جـەرگـێ مـه کـوردا ئـەڤ ڤـەدهێـرن[٣]
مگـــۆتی[٤] نـــێ فـــەره ل ســـەر مـــه ب پـــارێزن
کـــــو بســــــطینن[٥] ژ دوژمـــــن دوز و تـــــولا
دڤێـتن ئـەم ب پـارێزن ژبـۆ خـۆ کوهـ و چـولا
ڕوال و شـــــــــاخ و دەشـــــــــــــت و دۆلا
مگـــۆتی[٦] ئـــەی بـــڕازی نـــێ صـــەبـــر باشـــه
هـــەتـــا بێتـــه گوهـــوڕین وەصـــف و ئـــەڤ ئاشـــه
دەوامـــێ و هـــەر هـــەبـــین دائـــیم کـــو یـــەزدانـــه
ئەوێ باوەر ب ڤی نینه موحەقەق شێت و نەزانه

---

[١] ل جهەکێ دیتر:

ئەوی گۆت من نهۆ کورد بوونه دەولەت

بـەلێ ژبـەر پارەیی تم بوونه خـەت خـەت

[٢] من گۆت.

[٣] ل جهەکێ دیتر: دناڤ جەرگێ مه کوردا ژن و مێرا.

[٤] من گۆت.

[٥] بستینن.

[٦] من گۆت.

# مەلحەما ئەنفالا کوفرێ

مخابن بۆ وەلاتێ مە
کۆ ڕۆژ لێ بۆ شەڤا طاری
نەمان قەصرِ و کەلاتێ[1] مە
مرینە ئەم ژ بێ زاری
وەرە تو فەکرە حالێ مە
چاوا کەڤتینە بن باری
تو نابینێ ل دۆنیایێ
چو کەس وەك مە ل هەمی عەردا
دبن تێرێ ستەمکاری
کەتیە دەستێ نامەردا
پلامار[2] وان ل سەر مە هەر
دەمێ ل سەر مە دکەت جەردا
دبینێ دێل و ئێسیریت[3]
هەمی چاخ ل مە فەرمانە
چو گوند و ملك وار و چۆل
ژبۆ مە وان نەهێلانە
برا تالیا ئەڤی حالی
ژبۆ مە کۆ قەبر هانە

---

(١) کەلهە.

(٢) هێرش.

(٣) ئێخسیر.

ب هەمی ئەشكال و ئەرناكا[1]
خەریكن[2] بۆ نەهێلانێ
ژن و پیر و هەمی چاكا
دئێخن حەبس و زیندانێ
ب هزارا چوونە بن خاكا
دبن گۆرزێ عەذاب دانێ

ب گۆب و تانك و تەیارە
ب مۆشەیی[3] رووسی و ئەلْمانی
گەلی خەلكێ چ هاوارە
ڤەبریان كورد دەرمانی
گەلێ كوردی چ بێزارە
د دەست كافر و شەیطانی

چ ئەمریك و چ ئنگلیزن
هەڤالێ خۆرت و زۆردارە
دوو ڕژێمێ ڤەوی پیسن
ژبۆ كەس نا كنە چارە
ژ شەرمی طازی و ڕویسن
فڕەنسا زۆری غەدارە

چ رۆس و چین و هندینە
هەمی ئەو وەك ئەڤێن بووری

---

[1] ب هەمی جوران.

[2] مژویلن.

[3] موشەك.

ئـــەوان هـــيچ ڕەحـــم و ديـــن نينـــە
ل وان خۆشـــــــە قـــــــەوى زوورى

ژ هـــەميـــا قـــەط[١] نـــە هێڤـــى نـــە
بزانـــــە تـــــو بڤـــــێ جـــــوورى

نهـــۆ ژى هـــەر ئـــەڤێـــت زاريـــت
ژ دەســـــتێ كـــافرێ جـــەنتـــەل

ب هـــزارا كـــورد مـــرن پێكڤـــە
ب تـــــوز و كێميـــــا خـــــەردەل

ل ئـــــەنفـــالا ئـــەڤـــێ كـــوفرێ
ل هـەلـەبچـە و سـێ چـو هـو بـەر چـەل

موســـــۆلمانا قـــە دەينـــا[٢] كـــن
چمـــــا تشـــــتەك تـــــو نـــــابێژى

دبينـــــێ دێ مـــــە بـــــەريـــاكن
چ راگۆفتـــــەك تـــــو نـــــارێژى

خـــەريكـــن دێ مـــە ووندا كـــن
كـــەڕ و لال و تـــو هـــەم گێـــژى

بڤـــێ جـــۆرێ وە ديـــن نينـــە
دبێـــژم هـــوين نـــە ئيســـــلامن

موســـــــۆلمانى وەهـــــا نينـــــە
بڤـــێ نرخـــى هـــەمـــى عـــامن

ژ دينـــــى هـــــوين كـــۆ دەربينـــە
هـــەمـــى شـــاگردێ شـــەيطـــانن

---

[١] ل جهەكێ ديتر: قەت.

[٢] موسلمان نا ئاخڤن.

مەلیك فەهد[1] و تو دەیناكێ
خۆلامێ هەر دوو پیرۆزا
تو ب خاچ و صەلیباكێ[2]
ژبۆ مە چارەكێ بدۆزا[3]
تو بۆ كوفرێ چ مێرچاكێ
دگەل پەیمان هەم سۆزا
حوسەین[4] و خۆشی خۆلامی تو
ژبۆ ئنگلیزی بالیۆزی
دبینم تێر كەلامێ توو
ل خیطابا[5] وەك كەوێ گوزێ
دگەل دینی چ لالی توو
ژبۆ جوهیا تو چ دلسۆزی
موبارەك نەموبارەك[6] بێ
دبێژم تو موبار گوی بێ
ژبۆ شمعونی[7] وەك صەگ بێ
نەیارێ شەعبا كوردی بێ

---

(١) مەلك فەهد كورێ عەبدولعەزیزی، دناڤبەرا سالێن (١٩٨٢-٢٠٠٥)ێ، مەلكێ عەرەبستانا سعوودیە بوو.

(٢) خاچ.

(٣) دیتبا، پەیدا كربا.

(٤) مەلك حوسێن كورێ مەلك تەلال، دناڤبەرا سالێن (١٩٥٢-١٩٩٩)ێ، مەلكێ ئوردونێ بوو.

(٥) پەیام.

(٦) حوسنی موبارەك، دناڤبەرا سالێن (١٩٨١-٢٠١١)ێ، سەرۆك كۆمارێ مسرێ بوو.

(٧) شمعوون پیرس، دناڤبەرا سالێن (١٩٧٤-٢٠١٤)ێ، خودانێ چەندێن پوستەیان بوو، ژ ئەوان سالان سەرۆك وەزیر و سەرۆك كوماریا ئیسرائیلێ.

ل قەصرێ و لعابدین[1] بەگ بێ
بەلێ لطابە تو ڕێڤی بێ
ئەرێ ماسونیێ[2] کافر
د دەست ئەمریك و ئینگلیزی
هەمی چاخا ئەیا فاجر[3]
ژبۆ وان تو دلەیزی
دناسم تە ئەیا ماکر[4]
دزانم کۆ تو دایی حیزی

گەلۆ ما تو شەرم ناکێ
ژ خەلك و ئەهلێ دونیایێ
خەریکی دینێ دێ ڕاکێ
تو ناطرسی ژ عوقبایێ[5]
چ بێ ئەصل و چ نا چاکێ
دناسم تە کورێ دایێ

تە گۆ مۆشێ موسۆلمانە
ژمێژە ئەو بی یە موئمن
چ ئەفلاطون و پر زانە
ژبۆ قەومێ عەرەب بی بن

(1) زەینولعابدین کوڕێ عەلی، دناڤبەرا سالێن (١٩٨٧-٢٠١١)ێ، سەرۆك کۆمارێ تونسێ بوو.

(2) ڕێکخراوەکا برایەتیا جیهانیە و خودان ئێك هزروبیرن وەك ئەخلاق، ژیار، ئیمان ب خودێ و... هتد.

(3) کونەهکەر.

(4) فێلباز.

(5) ژ داویێ.

موفەکەر[١] و نیظام[٢] دانە
ژ لەو ئیرۆ لەپەیی ڕەفتن
هەمی کەس وی دناسیت ئەو
سەرێ ماسۆنیا کافر
نەیارە بۆ خودایی ئەو
نەناسێ دینیە و گاور
هزار لەعنەت ل سەر وی لەو
دبینم وی قیەم[٣] ڕاگر
دناڤ گۆرا موسۆلمانا
تە ئسپارتە[٤] زکێ عەردێ
ب فاتیحا و قورئانا
ژدەستێ مونکری بەردێ
مەلا کیرێ خۆ پێ را
ب ڤێ لەعبێ و ڤێ جەردێ
مەلا ل دوورێ چێبوون گۆمتل
ئەوان هەر دایە بەر دەورا
چ خواندن وان دوعا ژ دل
وەکی دەنگێ ژ کەر عەورا
ل وان هندا بوو باب و خل
چ کویرە کویرە ڤان جەورا[١]

---

[١] هزرڤان.

[٢] حکوومەت.

[٣] ڕاست و دروستی.

[٤] تە ڕادەستی.

دەما موشێ[٢] بی یە ژدایێ
مەسیحی بی هەمی وەختا
هەتا مر چوو ژ دۆنیایێ
نەوەك گۆتنا وە بێ بەختا
ئەڤ گۆتنە ژ پاپایی[٣]
تو هەر وی ڕاکە سەر تەختا
چ مەسرەح[٤] بوو تو پێ ڕابی
ب خۆدێ قەط[٥] تو شەرم ناکی
دەما مۆشێ ل تە هندا بی
نەشێ ئێدی ئەوی ڕاکی
ل باتێ خواندنا ل سەر وی
تو دا کیڕی خوە تێراکی

---

(١) ستەم.

(٢) میشێل عەفلەق (١٩١٠-١٩٨٩).

(٣) پاپایێ ڤاتیکانێ.

(٤) شانۆ.

(٥) ل جهەکێ دیتر: قەت.

## ئاخفتن دگەل جەحشا

ئـــەرێ مـــا هـــوین شـــەرم نـــاكن
گـــەلـــی جاشـــا ل دۆنیـــایێ
چمـــا هـــوین پـــیس و ناچـــاكن
ژبـــەر خســـمەك ب هوكـــایێ
بـــەرامبـــەر ڕاتبـــا ڕاكـــن
هـــوینێ دن وان ژ وان داریـــێ
وە نـــەدیـــن و نـــە نـــامووس
ژ لـەو هـوین بـین صـەیـێ ڕاڤـێ
ژ شـــەرم خیـــرەتـــێ ڕویســـن
وەكـی صـەیـی هـەردەم و گـاڤێ
وەكـی قـەحبـا چ چـاڤ خۆیسـن
كـەر و كۆرتـانی تـو بـاڤێ
بەسە ئەی صم[1] خرێت گوهـ شوور
ڤـەكـن چاڤـا ل دۆنیـایێ
بمـەزیـنن[2] ل چاخـەك دوور
تـو دێ زانـێ تـو بـەر بـایێ
ل دەسـتێ زاڵمـێ یـێ تـوور
ئـەمـێ كـەڤتینـە وەی وایـێ

---

(١) كون.

(٢) بەرێخوە بدەنێ، سەحكەنێ، بنێڕنێ.

تـــو هاریکـــاریَ نـــەیـــاری
کـــەرو مـــاتو شـــەرم نـــاکی
ژبـــۆ خوینـــا خـــو وەك مـــارِی
کـــو دێ هێلـــێ تـــو نـــا چـــاکی
دبـــن بـــاری تـــو بێـــزاری
تـــو چـــاوا هـــەر دەمـــێ د ڕاکـــی
دبێـــژن موســـتەشـــارن[1] هـــوین
بـــەلـــێ براســـتی حـــەســـاوینە
ژبـــۆ کـــوردا نـــەیـــارن هـــوین
ل نـــك وان پـــیس و بـــێ ڕوینـــە
ژبـــۆ خـــەلکـــێ گـــەوادن هـــوین
هـــەمـــی هـــوین تێکـــدا خوێرینـــە[2]
چـــو نینـــە ل نـــك وە گـــەوادی
ب پـــــارە بـــــۆ ژن و دایـــــێ
تـــو دێ قـــوینێ ژی پـــێ ڕادی
ئـــەگـــەر بـــدن تـــە جـــەهـــ و کـــایێ
بڤـــــی ئالیـــــك و ڤـــــی زادی
وە کـــوڕ وێ دانـــە بـــەر بـــایێ
وە هـــەڕفانـــدن جهـــێ خێـــرا
وە صـــۆتن دار و بـــاریَ مـــە
جهـــێ نـــاموس و بـــاڤێرا
وە وێرانکـــر وەڵاتـــێ مـــە

---

(١) دگۆتنە سەرۆك جاشان (موستەشار).

(٢) نە خوەش مرۆڤن.

هـەمـی مزگـەفـت و هـەمـی دێـرا
نـــەهـــێلان گـــۆر و مـــالێ مـــە

نــــــــزانم دێ چ بێـــــــژم وان
وەکـــی قـــەحبـــا شـــەرم نـــا کـــن
ئـــەگـــەر پـــارا بـــدن بـــۆ وان
بـــلا ئـــەو قـــۆینێ بـــەر بـــاکن
ئـــەگـــەر تـــو ڤـــەلڤینـــێ وان
دبێـــژن کـــورد و ئـــەم چـــاکین

وە صـــــوتن دار و بـــــارێ مـــــە
ب فـــــەرمانـــــا کـــــوڕێ دایـــــێ
ڕەز و بیســـــــتان بـــــاغێ مـــــە
نـــەمـــا بـــۆ مـــە ل دۆنیـــایێ
دگـــــەل ڕێـــــل و رویـــــالێ مـــــە
کـــەر و بـــۆچی تـــو پـــێ شـــایێ[١]

دخـــوم ســـۆندێ ب یـــەزدانـــی
ل مـــە ڕۆژ نـــی[٢] ببـــت جـــارەك
ئها هینگـــــێ تـــــو دێ زانـــــی
ژبـــۆ تـــە قـــەط[٣] نـــەمـــا کـــارەك
تـــو پیســـــتری ژ شـــــەیطـــانی
نـــەمـــا بـــۆ تـــە ل دنـــێ جـــارەك

---

[١] کەیفخوەش.

[٢] نوی، نوو.

[٣] ل جهەکێ دیتر: قەت.

کا ئەو خەج هەسنێ شرین
هەمی ڕەنگێ د هرمیکا
کانێ بەغدایێ ڕەنگین
کا جانیا خۆخ و حۆلیکا
ئەرێ کا کش مشێ شرین
نەما فێقی ل هەم سۆیکا

کانێ ڕەش مێو و همبانی
کانێ طائیفیێ پرشەنگ
کا گورکێلی و میرانی
کا ئەسپیندار و کا بی شەنگ
گەلۆ کا ئەو خەمل و جانی
کانێ گویزا گەلەك تێر ڕەنگ
نەما دار مازی و کەزوان
هەمی توخمێ د هنارا

نەما دیندار و نەما شاطان
نەما کەڤۆت ل زنارا
نەما داربەری و کاژا جان
نەما ب ناڤ ل ڕووبارا

نەمان ڕووبار و نەمان کانی
نەمان برك ل ئاقارا
کا ئەو سویلاڤ و ئەو جانی
کانێ سرکێ ل زنارا
کا ئەو جوکێت ل پشت بیستانی
بەلەك بەفرێ ل شوینوارا

نەمان سێڤێ د ئەخەلاتی

نە هەڤرست و کەنێرا جان

نە بێلمیر و بێلاتی

وە صوتن پێکڤە دەخڵ و دان

نە ئەو هێژیرێ بێناتی

نە تشتەك قەط[(١)] ژبۆ کوردان

هەمی طەیر و طەوالێ[(٢)] مە

ڤەبریاندن[(٣)] ب دەرمانی

کەو و باز و عوقابێ مە

نەطرسان[(٤)] ئەو ژ یەزدانی

دخۆم سۆندێ ب خودایێ مە

ئەون تلمیزێ[(٥)] شەیطانی

هەمی جاندار ڕەڤاندن وە

نەمان هرچ و نە پەز کیڤی

ژ طرسا[(٦)] ڕاتەقاندن وە

پڵنگ و شێر و هەم ڕێڤی

سڤۆرە ڕاپەراندن وە

هەتا گۆرکا نەما هیڤی

---

(١) ل جهەکێ دیتر: قەت.

(٢) تەواڵ.

(٣) ژناڤبرن.

(٤) ل جهەکێ دیتر: نە ترسان.

(٥) قوتابی، خویندکار.

(٦) ل جهەکێ دیتر: ترسا.

گــــەلۆ کـــانێ شـــەپـــرزێ جـــان

ئـــەرێ کـــا نێرگـــز و چاڤشـــین

نـــەمـــان گـــۆل بـــزن ریحـــان

بنـــەفـــش و سۆســـن و نـــەســـرین

نـــە گـــۆل هـــرچ و نـــە لیلـــۆز مـــان

هـــەلال و گۆلشـــەن و بـــەیبـــین

نـــەمـــا پـــەر کـــەڤـــك ل زۆزان

ئـــەرێ کـــا گـــۆل زەر و یاســـمین

نـــە هـــەلـــز و چـــەڤـــر و بایـــك مـــان

گـــەلـــۆ کـــا صـــۆرگولێ شـــرین

نـــە لیلـــۆز و نـــە گـــۆل شـــیلان

کـــا ئـــەو جانیـــا گـــەلـــەك ڕەنگـــین

کـــا ڕەبـــەنـــۆك و گـــول نـــەخـــوین

کـــل گـــول ئـــادار و نیســـان

نـــە سووســـن مـــان و کـــا بـــەیبـــوین

گیـــا نـــۆژدار و ئـــەو دەرمـــان

مـــا کـــا صـــۆریاز و ئـــەو چـــورین

قســـەل مـــەحمـــوود و ئـــەو پیـــژان

مـــا کـــا ســـێ بســـك و لۆیشـــە ڕەش

نـــەمـــا بێـــزا ماکـــا مـــەنـــدی

کـــانێ ریڤـــاس ئـــەوێ هنـــد خـــوەش

مخـــابن بـــۆ گیـــا بـــەنـــدی

کـــانێ بـــەلبـــەن ئـــەوێ هنـــد گـــەش

کـــا ئـــەو گـــەزوێ وەکـــی قـــەنـــدی

چ بێژم ئەز هەرێ کێمە
د پەسن و وەصفێ[1] کوردستان
ئەزی بێ وار و بێ ڕێ مە
هەمی چاخا ل من زستان
مە کوردا باغ نهۆ دێمە
ژ کاری ئەم لوا وەستان

ئەگەر چەند ڕۆژەکێ دیتر
بدم پەسنێ تە کوردستان
هەنە دەهە هندی ڤان بێهتر
تووێ هەر بۆ مە ڕوح و جان
ژتە نینە ئەبەد چێتر
د ئەقالیم و هەمی عەردان

تووینێ جنەت ل دۆنیایێ
ئەگەر بێتو بکار بینین
ژبۆ تە ئەم برین ڕایێ
ئەگەر بۆ خۆ تە بستینین
چ بێژم هەر تو هێژایێ
بلا ئەم خۆ ڤە برهینین[2]
خودا تو عالمێ غەیبێ
ژبلی تە کەس نەناسین ئەم
یەقین کەڤێ شك و رەیبێ
مە هاوارە ل تە هەردەم

---

(١) سالوخەت.

(٢) ژناڤبرن،

تـو راكــه ژ ســەرمــه ڤــێ عــەیبــێ

بــژین جــارەك كــۆ ئــەم بــێ غــەم

مــه ڕزگــار كــه ژ ڤــا[1] وەحشــا

ژ دەســــــتێ وا مــــــه دەرینــــــه

ژدەســــــتێ قاصـــــه و جـــــەحشـــــا

ئــــــەوان پێكڤــــــه ببرهینــــــه

دبینــــــێ كــــــافر و فـــــەحشـــــا

تــــو وا بگــــره و ڤــــەگــــەمرینــــه

ئــــەگــــەر تــــو مــــه ببرهینــــێ

ئــەڤــێ دێ هــیچ تــەنــاس نــاكن

ژ دەســــتێ حــــوكمی نــــەســــینێ

هــــەمــــی ئــــەحكامــــا دێ ڕاكــــن

خــــــودانێ وا تــــــوویێ بینــــــێ

دێ چـــــاوا دینــــی بــــەریـــــاكن

ئومێـــــــد داریــــــن ژ یــــــەزدانــــــی

فــــەلــــەك دیســــا بزڤــــرت ڤــــه

مــــه ڕاكــــت بــــۆ ســــەرێ بــــانی

ســـــــتەمكاریـــــــا وه بمـــــــرت ڤــــــه

ڤــــــەژینــــــت ڤــــــه ل مــــــه جــــــانی

كــــــەو ل زۆزان بخۆینــــــــت ڤــــــه

تــــو فــــەكــــره گۆتنــــا یــــەزدان

د قورئــــــانێ چ قــــــا خۆشــــــه

---

[1] ئەڤان.

ئـــەلـــەم نـــە شـــرح ڤـــەژینـــت جـــان
ل مـــــە گۆتنـــــا وی پـــــڕ خۆشـــــە
ئـــەوێ بـــاوەر نـــەبـــت هـــەر ئـــان
چ بـــێ عـــــەقـــل و چ بـــێ هۆشـــــە

ئـــەرێ ســـــندی صـــــەبـــر باشـــــە
تـــــو فـــــەكـــــرە دەقـــــا[1] قورئـــــانێ
ئـــەوێ بـــاوەر نـــە كـــت شاشـــە
بڕاســـــتی تـــــو ئـــــەڤـــێ دزانـــــێ
محـــەقـــەق[2] مـــە ئومێـــد باشـــە
خـــــودا دێ ئێـــــت ل ڤـــێ هـــانێ

---

[1] ناڤەرۆك.

[2] ب ڕاستی.

# سەر سەحار (پێنج گۆشە)

سەر سەحار و ئاڤەڕۆژا
جان شەمالا کییێ توو
شەڤ بەرات نەڤەرۆزا
نور ئاگرێ کییێ توو
صۆرگولا مەیدان بەلەك
سەروە[١] و چنارا کییێ توو
تو ب خودێ کێ بێژە من
کاتو دەلال کییێ توو
دێم هەیڤا شەڤا چاردە[٢]
دێم ب خالا کییێ توو
یارەکەم[٣] گەردەن ب لورە
ئەنیە مەیدانا بەلەك
دانە دوڕن یان صەدەف
ڕەیحان ل بەر بوسکێن[٤] هەلەك
جل ژ هەرمووشێ[٥] هەمی ڕەنگ
جل گۆلا گۆل پیرەهەنك[١]

---

[١] ناڤێ دارەکێ یە.

[٢] ل جهەکێ دیتر: چاردێ.

[٣] یارا من.

[٤] ل جهەکێ دیتر: بسکین.

[٥] ئاڤرمویش، حەریر.

ئاهۆیا[٢] ل دوڕێ نهێلێ
کویڤیا ل شاخێ بەلەك
حوریا بەخچێ[٣] بەهەشت
کەودەر دەلالا کییێ توو
هات و ڕاوەسطا[٤] ل پێش ڤە
من ڤیا بچمە طەواف
قیبلەگاها من هەژاری
شەنگولا ئەبر و زراف
دەرد و کۆڤانا ل من سەردا
صۆتی[٥] جەرگێ من تەڤاف[٦]
نێرگزا ل دۆلا طەنینێ[٧]
گۆل نەخوینا پڕ خۆناف
شیشەیا مسکا عەدەن
کا شۆخ و شەنگا کییێ توو
ئەڤ چ دێمە هۆ شەفاف[٨]
ئەی گۆلشەنپێشا بهار

---

[١] (پیراهەن) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (کراس، گوملەك) ددوت.

[٢] (ئاهۆ) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (غەزال، خەزال) ددەت.

[٣] ل جهەکێ دیتر: بەخچەی.

[٤] ڕاوەستا.

[٥] ل جهەکێ دیتر: سۆتی.

[٦] هەمی، گشت.

[٧] دەڤەرا حەفت تەنین.

[٨] نازك.

صەد هزار ئاوازی هاتن
کەو و بولبول[١] چار کەنار[٢]
مەنتەشە[٣] دا بەست و هاتن
ڕەش کەزی ئێلان و مار
بابەلێسا ل بەر کەڤی
یا یاسەمینا[٤] ل مێرگەهار
لەب[٥] بەخەندێ[٦] نێ تو ڕەندی
گۆل عوزا ڕاکییێ توو
بیست و پێن[٧] صاڵی[٨] ب خۆشی
کەڤتمە داد و مەدەدە[٩]
من نزانی چەرخا دێمێ تە
وەکی بوڕجا ئەسەد
چەنگەلەك ئاڤێت دلێ من
تیر ژ وێ ڕشتن دوو صەد
دلڕەقا هشك و بەرینی
من دڤێت ڕەحمێ بدەد[١]

---

[١] ل جهەوکێ دیتر: شالیول.

[٢] چار ڕەخ و ئالی.

[٣] ڕستك.

[٤] ناڤێ گەلەکیە.

[٥] (لەب) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (لێڤ) ددەت.

[٦] (خەندە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (گرنژین، کەنی) ددەت.

[٧] بیست و پێنج.

[٨] ل جهەکێ دیتر: ساڵێن.

[٩] هەوار و گازی.

جان ل سەر تەختێ ئەڤین

فکر و خیالا کییێ توو

پڕ نقێس کاتبێ غەیبێ

ژ نۆڕا لایەزال[٢]

ئەو چ خالە ل گەردەنێ

مینا بەرێ ڕەش ماهـ و صال

چەندی صالێن فەرضە[٣] ئەز

بچمە طەوافا زۆلف و خال

بسك و بەر بسك و كەزی

وێ دانە بەر بایێ شەمال

تو ش رینی هەژدە صالێ[٤]

چاردە خالا کییێ توو

ئەو چ عاجە[٥] ڕەنگ زوجاجە

ئەو چ ڕوو چ گەردەنە

ئەو چ زەندێن ڕەنگ خنائی

ڕشتنا خوینا منە

وەکی ڤێ جان و جەحێل

هەما قەط[٦] ل دۆنیایێ هەنە

---

(١) ل جهەکێ دیتر: بدەت.

(٢) هەردەم هەیی.

(٣) ئەرکە.

(٤) ل جهەکێ دیتر: سالێ.

(٥) عاجا فیلی.

(٦) ل جهەکێ دیتر: قەت.

ئـــەڤ چ دۆڕرە كـــەڤتـــە بوڕجـــا
موشـــتـەری بـــوو مـــەســـكـەنــــە[1]

دێمـــــــــە ڕۆژ و دل دصـــــــوژ
قـــەد و شـــەمـــالا كییـــێ تـــوو

مـــــن كتێبـــــەك وا دڤێـــــت
بــەحســێ ئــەڤینــی بــت تــەمــام

صـــەد طلســـم[2] فـــالی تێـــدا
پێكڤـــە عیبرانـــی مـــەقـــام

جـــەل جـــەلـــۆتێ ئـــەز دخـــوینم
عــەقــڵ و هۆشــی چوونــە تــەمــام

حوریـــا بـــاغێ بـــەهـــەشـــتێ
كـــەودەری بـــەرزە مـــەقـــام

غـــــەیـــــری ســـــندی
پادشـــا مـــن دەلالا كیـــێ تـــوو

---

(١) جهوار.

(٢) تلّسم ڕاگرتنا كارەكی ب ڕێكا جادوویێ.

## شوعلا دەلال

جـــارەك مــــەدى شـــوعلا[1] دەلال
ديســـا ل مـــە هلدايـــە ڤـــە
هــەر وەكـــى قـــەعقـــاعىَ[2] ل ســەر
نـــاڤىَ كـــو ليَـــك هلدانـــە ڤـــە

چــەن مــەنظــەرا[3] لــىَ فــەرجــيم[4]
هــەم كــەيــف و گۆڤــەنــد و ســەمــا
پاشـــى دخـــوينى گـــەبجـــيم
گاڤـــا كـــو ليَـــك هلدانـــە ڤـــە

چاخـــا كـــۆ ئـــەو ســـەرگـــوم[5] دبـــوون
ســـەودا و عاقـــل مـــن دچـــوون
ديســـــا دخـــــۆنىَ وەردبـــــوون
هـــا كاهـــنا ســـەحـــارە ڤـــە

ســـەحـــڕا وىَ ئـــەز ئـــەبتـــەر[6] كـــرم
ژ عـــەينـــىَ حـــەيـــاتىَ[1] دەركـــرم

---

[1] خەتير.

[2] ئاڤا گەلەك سوير.

[3] ديمەن.

[4] سەحكەرىَ.

[5] (سەرگوم) پەيڤەكا فارسيە و ڕامانا (بەرزە، هندا).

[6] ب تنىَ هيَلام.

پێچام د غەریبێ وەرکرم
ڕۆژا زەلال ل من بۆ شەڤە

دائیم شەڤ ل من طاری یە
هەردەم گرین و زاری یە
ساخی کۆ هوبت بۆچی یە
ڕابە ل مرنێ داکە ڤە

من ژین ل ڤێ عەردێ نی یە
ژینا ب ڕەزالەت بۆچی یە
ئێش و ستەم من ژێ دیە
حالێ ئەڤیندارا ئەڤە

حالێ ئەڤیندارا ووهە
دائیم فەقیر و بێ جهە
دڵ قورمچی هەر وەك ژ هە
هەردەم ژ نیسکێ ئەو کەفە

چەند عاشقێ پێش مەبوون
پێکڤە هەمی ئەو سۆختە[٢] بوون
ل ژینا دنێ بیهودە[٣] بوون
هەردەم ل وان جەور[٤] و جەفە[٥]

---

(١) ژ ژیارێ ب خوە.

(٢) (سوختە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (سۆتن) ددەت.

(٣) (بیهودە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (بێ مفا، بێ قازانج، بێ بەرهەم و...) ددەت.

(٤) ستەم.

(٥) دلڕەقی.

حــــافظ[١] دگـــەل ڕاجـــی[٢] ئـــو مـــەم
ســــەیــــدایی جـــــزراوی[٣] ژ هــــەم
ڕێکــــــا دورســـــــتی وانــــــە دی
ســــندی[٤] دگــــەل وا هــــەم ڕەفــــە

---

[١] ڕەنگە مەبەست حافزێ شیرازی (١٣٩٠-١٣٩٠ز). بیت.

[٢] ڕەنگە هەمان مەلا مەحموودێ یووسفی بیت.

[٣] مەلایێ جزیری (١٥٧٠-١٦٤٠).

[٤] ل جهەکێ دیتر: نوری.

## بهار خۆشە (سێ گۆشە)

بهار خۆشە چاخەکێ شینە
دبێ مەحفوور نەقشینە
چ تێر خەملە چ ڕەنگینە
تژی گۆل شەنگ و نسرینە
هەمی گۆل پێکڤە دەربینە
ڕوییێ عەردێ نەما بەفرە

چ خۆش وەختە ژبۆ لاوا
جەحێل و جان و دل دا وا
بچن گەشت و بکن ڕاوا
ل سەر شاخ و ل سەر ئاوا
ئەگەر بێژ من تە حال چاوا
ژیان من هەر وەکی قەبرە

سەحەرگاها[١] دنالم ئەز
ژ عشقا صۆرگولا ژووری
نە دلخۆش و نەباشم ئەز
ب ڤێ نرخێ ژیان بووری
وەکی گۆین دنالم ئەز
ل هەر چاخ و هەمی دەورە

---

[١] (سەحەرگاها) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (سپێدەهیان) ددەت.

عەنادل[1] شەڤ گەها دخوینن
دگەل شالوول دلۆرینن
ب خێر و خۆشی و ژینن
ژ ئەڤینێ سەرخۆش و دینن
نە وەك من ئەو دبوورینن
ل من خوارن وەکی ژەهرە

هەمی گاڤا ب کۆڤانم
ب ئاه و ئۆه و گریانم
دبینێ مەست و حەیرانم
ژبۆ دلبەر دلۆڤانم
لەغەر[2] لاشم[3] ب دامانم
هەمی وەختا ل من جەورە[4]

وەکی قەقنەس[5] دخوینم ئەز
وەکی زەرقا[6] دبینم ئەز
وەکی فەرهاد[7] نهینم ئەز

---

(1) باڵندە.

(2) (لەغەر- لاغەر) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (لاواز) ددەت.

(3) (لاش) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (کەلەخ) ددەت.

(4) ستەم.

(5) جۆرەکێ باڵندەیانە و گەلەك جوان و دەنگ خوەشە.

(6) زەرقا ئەلیەمامە، ژنەکا ناڤدارا عەرەبە و ژ هۆزا (جەدیس) بوو، کو دویراتیا سێ ڕۆژان تشت ددیتن.

(7) داستانا فەرهاد و شیرین.

وەکـــی فـــەرخـــی[1] د چـــەریـــنم ئـــەز
وەکـــی مـــەجنـــوون[2] دمیـــنم ئـــەز
تنـــــــێ ل چـــــــۆلا ددەم دەورە

[1] فەرخ و ستی.
[2] لەیلا و مەجنون.

## شەنگە گولا صۆر و زەر

ئیـــرۆ مـــەدی ســـەر ســـەحـــەر
شـــەنگـــە گـــولا صـــۆر و زەر
بشـــگفتیەیـــە ل ســـین گـــەڤـــەر
ڕۆهنـــــە وەكـــــى شیشـــــەیــــە

ڕۆهنـــــــــــــــــە زەلال و دەلال
برهـــێ كـــــەڤـــان و هـــــیلال
صـــــۆرگوله بلبـــــل هـــــەڤـــال
ڕوح و ڕەوانـــــــا مـــــــەیـــــــە

ڕوحـــە ب خـــۆ ئـــەو مـــەلـــەك
ڕەنـــد و جـــەحێـــل و چـــەلـــەك
چـــاڤێ ب ســـۆڕمە[١] و بـــەلـــەك
چـــەنـــدى بێـــــژم وەیـــــە

چـــەنـــدى مـــە دیـــتن دەلال
نـــابن وەكـــى ڤـــێ شـــەپـــال
چـــاڤێ بـــەلـــەك ســـۆڕمە خـــال
وەڵڵاهـــ گـــەلـــەك تـــازەیـــە

وەڵڵاهـــ شـــرینە قـــەنـــدە
ڕەنـــد و پـــەریـــە خـــەنـــدە

---

(١) كلێ چاڤان.

ژ کوچەری ڕەڤەندە
کیوڤە بچیت بۆ مەیە

کیوڤە بچت ئەو پەری
پێ وێ ل سەر ڤی سەری
دگەل وێ دکەم کۆچەری
چنکی بۆ مە فایدەیە

چونکی مە دل گرێدا
وەعدە مە هۆ ب وێدا
گەر بمرم د ڕێدا
باش و گەلەك تازەیە

باشە ئەرێ کەو دەری
ئەی دلڕەقا وەك بەری
دگەل من تو ناچەری
مە هەر ئەو ئامادەیە

مە هەر دڤێت پێکڤە بین
نابت کو ئەم ژێکڤەبین
ئەم تشتەك بیهودە[١] بین
گفتوگۆ بێ فایدەیە

گۆتە مە قڕقڕ نەکە
سەیری جوانیا مەکە
تو ناکرێ ب صەد لەکە
ئیرۆ بەلاش بۆ تەیە

---

(١) (بیهودە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (بێ مفا، بێ قازانج، بێ بەرهەم و...) ددەت.

ئیرۆ بەلاش بۆ تە ڕەز
خوخ و هناران بگەز[1]

وەر تو طەوافێ بلەز
حەجا تە سینگێ مەیە

حەج و طەوافا ل نکە
ڕۆکنەکێ دینی بکە

گۆهە نەدە طەعن و چکە
فەرضە ژ دینێ مەیە

سندی تو شێرە مێری
ئاشەکی هوير دهێری

تو هەر دوڕا دبژێری
تەچی بڤێت بۆ تەیە

[1] (بگەز) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (لەقدە) ددەت.

## ئەليفێ هەتا يائێ

أ- ئەی ئەنی ئايينە ئەبرۆ
مونحەنی[1] هەر وەك هيلال[2]
تا قيامەت داغی[3] دارم[4]
بۆ تە ئەی خفشا غەزال

ب- بلبلێ[5] باغێ بهارم
يەك دەمێ نينە سەكەن[6]
عاشقێ وەردێ بخارم
لەو دبينی بۆ مە لال

ت- گەرحە يێت تاتا تو تەركە
ژ عەنبەر و مسك و گۆلاب
بەردە سەر كۆما گولا
گاڤا كو بلبل[7] بێتە بال

---

(1) چەميايی.

(2) هەيڤ، مەه.

(3) وەك داخا دلی.

(4) (دارم) پەيڤەكا فارسيە و ڕامانا (من يا هەی) ددەت.

(5) ل جهەكێ ديتر: بولبول.

(6) ڕاوەستان.

(7) ل جهەكێ ديتر: بولبول.

پ- پیکلی پاب پلاپین[1]
وەکی مارێن د ڕەش
هەر دەمێ طڕسێ[2] دکم
دا ئەو نەکن لەق دان ل بال

ج- جەوهەرا[3] جانا جیهانێ[4]
جەننەتا باغێ ئێرەم[5]
دێ ڤەخووم ژێ پچکەکێ[6]
خەمرا[7] ب شەرعێ ئەو حەلال

ح- حوریا حەوچا[8] حەیاتێ[9]
حولەئێ سۆندس[10] دبەر
کوشتیمە وێ ب عیتابێ[11]
بۆ من نینن چو مەجال

---

(1) دەیکا وی ژ دەست بدەت.

(2) ترس.

(3) هێژا، ماقویل و...

(4) ل جهەکی دیتر: جهانو.

(5) باغێ جزیرا بوتان.

(6) ل جهەکێ دیتر: جورعەیەك.

(7) عەڕەق، مەشروب؛ ل جهەکێ دینر: مەیا.

(8) حەوز

(9) ژیار، ژیان؛ ل جهەکێ دیتر: حەیاتو.

(10) ئاڤرمیش، حەریر.

(11) ب نەخوەشی و ئەشکەنجێ.

خ- خەطـ(١) و خالێن خاوەری
خڕپوون ل سەر دێم و ڕویا
پێڤی(٢) ئەز هەر بۆ طەوافێ
لەو دبیێ ماه و صال

د- دۆڕێ دەر دەریا دبینم
تو تنێ دوڕا یەتیم
گەر ببێ پەرتال(٣) ل سویکێ(٤)
دێ کڕم پێ جان و مال

ژ- ذقت ذرعا من ذرا ریح(٥)
ژ وی جسمی یقین(٦)
هالکم ئەز هەر ژ وێ
ژەهرێ ل من هەر ئاه و نال

ڕ- ڕەوضەیا(٧) ڕەونەق(٨) ڕەوایە
ڕەند و حوری لێ بمەش(٩)
حوری گش ئیرۆ نە ڕەندن

---

(١) خەت.

(٢) پێدڤی.

(٣) کەلوپەل.

(٤) ل جهەکێ دیتر: ل بازار.

(٥) واتە (تاما نەخوەشیێ ژ توزا بای دەمێ توز خوە ل ناڤ چاڤان ددەت).

(٦) بێ گۆمان لەشێ من د کەڤتیە نەخۆشیێ دا.

(٧) باغ، مێرگ.

(٨) گەشاتی.

(٩) هەڕە.

تو تنێ بۆ من غەزال

ز- زۆلفێ[1] زەر زنجیرێ زێرن
بوونە سیما[2] بەخچەیێ
بلبلێ[3] ژار و ڕەبەن[4]
دەر داڤێ دائیم قیل و قال[5]

س- سووسن و سەیوان و سنبل[6]
چیمەنان گرتن خوناڤ
نێرگز و ئالال و گول
ناڤ باخچەیان لێك دانە پال[7]

ش- شەهدە ئو شەکرا شرینۆ
شەربەتا ڕوویێن بەهەشت
هەر هەمی خوزیا تەیە
جان هندە شرین و زەلال

ص- صۆرگولێن صۆر و ب ڕەنگ[8]
صوهتم[9] ژ ڕەنگێ ئاتەشێ[10]

---

(١) بسك.

(٢) تان، پێژان؛ ل جهەکێ دیتر: طان.

(٣) ل جهەکێ دیتر: بولبول.

(٤) هژار و بەلەنگاز.

(٥) گۆتگۆتك.

(٦) ل جهەکێ دیتر: سونبول.

(٧) پالدانێ.

(٨) ل جهەکێ دیتر: صوهڕن صیفەت.

(٩) سۆتم.

(١٠) (ئاتەش) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (ئاگر) ددەت.

شـــوبهێ[١] خـــەلكـــێ دووژەهـــێ[٢]

دائـــیم ل مـــن هـــەر ئاهـــ و كـــال

ض- ضحضـــــح ضـــوء فضــــاء[٣]

ئـــــەز بێـــــــژم ڕۆژە یـــــان

هـــەیڤــا چـــاردە ئـــو كـــەڤتـــی

ئـــــەو دنێـــــڤ بورجـــــا حــــەوال

گ- طوطیـــا طـــاهر[٤] ل طـــۆڕێ[٥]

خوانــــد و بانگـــــەك بـــــۆ مــــە دا

گــــو[٦] وەكـــــی موســـــی[٧] وەرە

دل پــــــوڕ بكـــــــە ژ نـــــورا زەلال

ظ- ظــــالمێ ظـــاهر[٨] ظـــولم كـــر

ظــەهــر[٩] ل مــن كــر وەك كــەڤــان

دائـــیم ئـــەز شـــەیـــدا و شـــێتم

مـــن نـــە حالـــە نـــە حـــەوال[١٠]

ع- عـــەرعـــەرا عـــالی[١] عـــەدل[٢]

---

[١] ل جهەكێ دیتر: مینا.

[٢] دۆزەخ، جەهنەم.

[٣] واتە (ڕۆناهیك ژ ئەسمانا پەیدا بوو).

[٤] پاقژ، پاك.

[٥] چیایێ تورِ ئەو چیایێ مووسا دچوو سەرێ وێ و ل گەل خودایێ مەزن دئاخڤت.

[٦] گۆت.

[٧] مووسا پێغەمبەر (س).

[٨] دیار و ئاشكرا.

[٩] پشت.

[١٠] چ ڕێك نینە.

هەر شەئن[٣] و ئیحسانا[٤] تەیە

موژدە بت بۆ من کو ئیرۆ

یەك ئیشارەت کر ل مال

غ- غەمزەئی[٥] غونجا[٦] غەنیمەت[٧]

دەر غەلەس[٨] پەیدا بکت

کی تنالوا لذه[٩]

أحلى من الشهد الزلال[١٠]

ف- فککت لی فی الفیافی[١١]

باب روظ من جنان[١٢]

أمرتنی بالدخول[١٣]

قبل خلع من نعال[١٤]

---

(١) بلند.

(٢) راست.

(٣) کریار.

(٤) خێرخوازی، قەنجی.

(٥) رۆهن و ئاشکرا.

(٦) تەلیس، ئامان.

(٧) دەستکەڤت.

(٨) د بەرپەڕان دا.

(٩) واتە (دا هوین تاما خوەشیێ ببن).

(١٠) واتە (شرینتر ژ هنگڤینێ زەلالێ ڕەسەن).

(١١) واتە (بو من د بیابانێ دا بەرفرەە بوو).

(١٢) واتە (دەرگەهەك ژ مێرگێن بەحشتێ ڤەبوو).

(١٣) واتە (تە دەستویر چوونا ژوورا من دا).

(١٤) واتە (بەر ئەز پێلاڤا خوە بێخم).

ق- قلـــت قـــولا ثـــم قالـــت[١]

قـــم لنــــذهب للســــرور[٢]

قلـــــــت مـــــــولاتى[٣]

ســروري علـــى[٤] النيشـــان[٥] خـــال

گ- گرگـــر و كورِكـــورِ مــه دى[٦]

ل نـــاڤ جنـــة المـــأوى يـــەڤـــين[٧]

ئـــەز نـــزانم ئـــەز شـــيارم[٨]

يـــان ئـــەڤ خـــەون و خيـــال

ل- لاعبتنـــي لحظـــة لـــيلاى[٩]

مـــن بعـــد اللقـــاء[١٠]

صـــرت ســـكرنا كـــا-

ن الخمـــر فـــى رأســـى جـــال[١١]

م- مـــەيمـــەن و مـــەيســـەر[١٢] مـــە

[١] واته ( من گۆتنەك گۆت پاشى وى گۆت).

[٢] واته (دێ ڕابە دا بچينە كەيفخوەشيێ).

[٣] واته (من گۆتێ ئەز قوربان).

[٤] واته (كەيفخوەشيا من ل سەر).

[٥] ل جهەكێ ديتر: النيشان.

[٦] مە ديت.

[٧]واته (بەحشتا بێ گۆمان).

[٨] هشيارم.

[٩] ياريا ل گەل من دەمەكێ شەڤێ.

[١٠] واته (پشتى ديدارێ).

[١١] واته (ئەز مەست و سەرخوەش بووم).

[١٢] بەرفرەهى.

ئیرۆ تەڤ غولام و سوختەنە
ئیرۆ ئەز شاهم وەکی
کەیخسرەو[١] و ڕۆستەمێ ڤال[٢]

ن- ناڕ[٣] و نوّڕ[٤] و نەجمێ نوری[٥]
ئیرۆ تەڤ بوونە عەیان[٦]
پاشی وان جەور[٧] و جەفائی[٨]
وی دخوارن ماه و صال

ه- هود هودە هاوارێ هاتو
گۆتە من بەلقیس مری
ئاصنێ[٩] تەختێ وی ئینا
بۆ مە حاضرکر ل مال

و- وەهـ وەهـ و هەو و هەو کەتن
ناڤ قەصڕ و ئەیوان و سەرا
داوەتی و بەریوویێ مە
حوّڕ[١٠] و غیلمانێ[١] دەلال

---

(١) شاه.

(٢) ڕۆستەمێ زاڵ.

(٣) ئاگر.

(٤) ڕۆناهی.

(٥) مەبەست (نوّڕەدین)ە، خودانێ ڤی دیوانێ.

(٦) پێشچاڤ.

(٧) ستەم.

(٨) دلڕەقی.

(٩) ئاسن.

(١٠) حوّڕ.

ی- یـا خودایـا یـارەحـیم[٢] و یـا کـەریـم[٣]
یـا لـەطیف[٤] و یـا عـەلیم[٥] و یـا حـەلـیم[٦]
بخشــە ڕەحــێ تــو ژبــۆ ســندیێ فــەقیــر
ژی دریــژ بــت بــووم[٧] جانــا هــەژدە صــال

(١) غولام.

(٢) دلۆڤان.

(٣) دەستڤەکری.

(٤) جوان، خوشکۆك.

(٥) ب زانین.

(٦) نەرم.

(٧) ل جهەکێ دیتر: بوومە.

# ڕاڤە کەو

چـــو[١] ڕاڤ ناگـــەهـــن ڕاڤـــا ڕپـــادی[٢]
ڕوونـــــی ســـــمبێلا ل پـــێش وان بـــادی

بـــەلـــێ دڤێـــتن کـــەوێ تـــە بـــاش بـــن
ل ســـەر مـــەســـەبـا مسـعار[٣] و ئـاش بـن

وەکـی کـەر عـەورا ئـەو ب گـۆڕ گـۆڕن
ل هـــەمـــی مـــەســـەبـا هـــەر ئـەو بخـۆڕن

بکـــن هنگامـــە[٤] ل ســـەر گرکـــا
دا کـــەوا بکێشـــن ژ دەڤـــێ دولکـــا

نێچیـرا ب ڕهـۆشـە هـەر ئـەو شـەڤ دەسـتە
پێشـــی بـــەیـــانێ[٥] ڕپـــادی بـــەســـتە

تـــو بـــاڤێ کـــوزێ بـــەرێ بـــەیـــانێ
ســـەرداری ل هنـــداڤ ڕپـــادی دانـــێ

داڤـــا ب ڕەشـــینە دوو صـــەد د ڕێکـــا
دا تـــو بگـــرێ ســـەرە حولیکـــا

---

(١) ل جهەکی دیتر: چ.

(٢) کەوێ ڕپاد.

(٣) زڤرین.

(٤) (هنگامە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (دەم) ددەت.

(٥) بەرێ سپێدێ.

بییە قیامەت گوڕگوڕ و پڕ پڕ
زنجیرا پێ ڕیادی زڕ زڕ

پاشێ تو ڕابە هەرە سەر کۆزێ
دەمزەر گەڤزین دراڤ و تۆزێ

ڕاڤا بهارێ پاشی نەفرۆزێ
دڤێت مەسەبا تازە ڤەدۆزێ[1]

کوزێ قائیم کە ب ترکا و چولی
دا کۆڤان ڕابن بۆ تە ژ سەر دلی

چونکی[2] کەو هینگێ وێ د ڕەفا دا
پێکڤە هجوومە بۆ سەر ڕیادا

دەمێ جۆتکا نێچیرا سەنگە
ڕیاد لەیزی بۆ شەڕ و جەنگە

دەما جەلا بب گێلاسی خوری
مێکەو ل پێشیا نێرێ خوە فڕی

دا تلیلیا ل پێش نێرە کەوی
طەحن[3] وچکێ وێ هەودانە ئەوی

هات و لەیزی[4] ل سینگێ ڕیادی
دگەڵ مێ کەوێ چ بێ مرادی

---

(١) (دوز) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (دیتن، پەیداکرن) ددەت.

(٢) ل جهەکێ دیتر: چنکی.

(٣) ل جهەکی دیتر: تەحن.

(٤) سەماکرن.

سەردار تەحلکە گازی کرە ڤێ
کا وەرە بۆچی بووم دەرناکەڤێ

ئەز و بنداریـن هەر د ب تنێ نە
سەرۆکێ کەوێ هەمی دنێ نە

ئەگەر هوین مێرن وەرن شەڕێ مە
بەلێ ئەز چ بکم مێرینی کێمە

سەر ڕەڤی گۆتی صەی کوڕێ صەی
زێدەی بابێ خۆ هەر تو یێ د ڕەوی

ئەز وێ هاتم تە قوجە بەهەڕم
دێ تە و ڕیادی پێکڤە هلدڕم

ڕیادی گۆتە سەرداری بێژێ
تو کەڤنە قوونێ ڕەڤیەکی ژ مێژێ

کا وەرە پێش بەر شەرێ مێرخاسی
دا تو باش و چاك ئەصلی خۆ بناسی

بێژە وێ نێ ئەز لالێ سێ بانگم
ل ناڤ هەر کەوا ئەز ڕۆژ و مانگم[1]

وەکی دەستاری ئەز هویر دهێرم
ل شەڕ و هنگامێ[2] ئەز شێرێ نێرم

بی شەڕێ مێر و شێر و پڵنگا
وا دەینا هەڤدوو ب دەنوك و چنگا

---

[1] هەیڤ، مەە، ژ زاراڤێ سۆرانی هاتیە وەرگرتن.

[2] (هنگامە) پەیڤەکا فارسیە و وڕامانا (دەم) ددەت.

کـەو پێکڤـە کـەتـن قیـژی و خیلایـا
مــــێ کـــــەو ل پێشـــــڤەدا تلیلیـــــا

ببیـــــە پــــڕە پـــڕ ل پێشـــــیا ڕپـــادی
حــــەقـــــە وێ گـــــاڤێ ســـــنبێلا بـــادی

ڕپـــــاد دبێـــــژت ئـــــەز لالـــــێ پـــــاخم
ل هــــەمــی هنگامـــا ئــەز هــەر ب زاخــم

جــــەلاب د[1] بێـــژت تــــەحلکـــێ گێـــژم
ل ســـەر مــــەســـەبـا ئــەز دەنـــگ درێـــژم

بـــن دار د[2] بێـــژت ئـــەز تـــەڤـــی ژیـــنم
دم صـــــۆرا ل دور کـــــوزی د جــــــەمیـــــنم

خـــــودیێ[3] مـــــە هـــــەردەم ســـــەر فــــەرازە
مـــە دەنـــــگ خۆشـــــترە ژ زرنـــــا و ســــازە

نـــــوری[4] دزانــــــت قـــــــەدرێ نێچیــــــرێ
ژیـــــۆ وە دەینـــــــت ڕاو و تـــــــەدبیــــــرێ[5]

ســـندی نـــاس دکــت تــم تــوخمێ کــەوا
ژیـــــــۆ وە چێکـــــــــت دەرمـــــــان و دەوا

یـــا ڕەبـــی ب حـــــەقـــێ ئـــەنبیـــا کـــی
ســـندی تـــو ب ڕاڤ و ڕەحمـــێ شـــا کـــی[6]

---

(١) ل جهەکێ دیتر: ت.

(٢) ل جهەکی دیتر: ت.

(٣) ل جهەکی دیتر: خودانێ.

(٤) مەبەست (نۆڕەدینە) خودانێ ئەڤێ دیوانێ.

(٥) ڕێکەچارە.

(٦) کەیفخۆش کی.

## ڕاڤە کێوڤی و ڕاڤا دیتر

ڕاڤەکەری شۆلێ شاهـ و بەگانە
ئیرۆ کەت دەستێ پیس و نەزانە

چو کار ناگەهن خۆشیا نێچیرێ
لێ د وێ گاڤێ تو شاهـ و میرێ

نێ مەرگ هەر ئەوە ئێ کو ل چولێ بت
ل سەرێ بڵند یان ل دۆلێ بت

یان ل سەر چەلی یان ل بەر بەری
بنێرێ حەیوانا وێ بۆ خۆت چەری

ڕوینە چەپەرێ بەرێ بەیانی
دا تازە و باش شۆلا خۆ بزانی

بەیان لێ بدەت دڤێت هشیار بێ
هەکە نێچر هات دا ب کار و بار بێ

دەما خۆیا بن هندەك شاخ بلند
دگەل وان بزان جان قشت[1] و ڕند

دەست دە برنوێ بێژە بسم اللە
سەرێ هەر تشتێ هەر ناڤێ اللە

سێهرێ[2] لێ بگرە ژی ببژێرە
نێریێ حەفت صاڵی ئەو ب خێر و بێرە

---

[1] ل جهەکێ دیتر: خشکۆك.

[2] ستێرکێ.

بدل موحكومی[1] بەردێ و نە طرسە
ئەگەر نەزانی ژ من بپرسە

هشیار بن هوین قەد[2] ژ جهـ نە رابن
هەکەر وەك جنا دێ ل وە هندا بن

نێریێ دەهـ صالی و ژ دەهێ ویڤە
چو گوشتی قەلەو نامینت پێڤە

بەری گەرهوکێ نێری ترخانە
چەرا وی هنگێ وا ل رێلستانە

چاخێ بچەرن ل جەرد و دەڤیا
تو تەماشاکە ل بەژنا نێریا

نێچیرا براستی دەمێ گۆهـ نێلێ
کویڤی کۆم ببن ل دەڤ نهێلێ

تو دێ ژ کەیفا هنگێ دلخۆش بێ
ژێ ببژێرە داتو دلگەش[3] بێ

راڤا بەرازا ئەو ژی زۆر خۆشە
بەلێ یا مارا ئەو دل ب جۆشە

پیشان هەبوو وە راڤا غەزالە
نهۆ نەمانە لەو بۆ بەطالە

هرچ و وەشەك و پلنگ ل چیا
راڤا ئەڤان زۆرا ب تەحلی یە

---

(1) بدل موکومی؛ ل جهەکێ دیتر: محکومی.

(2) ل جهەکێ دیتر: قەت.

(3) ل جهەکێ دیتر: کەیف خۆش.

نێ فەرە ڕاڤەكەر مێرەكێ باش بت
نە طڕسنوك[1] و خەوتوو و شاش بت

ئەگەر نە مێر بت دێ وی دڕینن
چەندەك و لاشا[2] دێ لێ خڕینن

جارەكێ ل چۆلێ هرچەك هاتە من
ڕابێ شپیاڤە بەرامبەری من

دەڤێ وێ كەف دا لێ بێ عورەعوور
ئە[3] دەست ناهلینم ئەزم ئێ سەرشوور

من تفەنگ (برنۆ) ڕەقەم حەڤدە بوو
ژێ دەستهلێ تم ئامادە بوو

مرا شەقاندە كلۆخێ سەری
گیربوو ئەو گامێش كەتە بەربەری

جارەكا دیتر ئەز ل چۆلێ بیم
چوو بووم نێچیرێ ل سەرێ دۆلێ بیم

هات من ب ڕووپێش هرچێ گورگەمێش
كرە قوڕەقوڕ ل من هاتە پێش

ڕەشاشا ڕوسی ملێ ڤەكێشا
ساجوور خالی بوو دل ل وێ ئێشا

كەت و درێژ بی ل بەر پێ من
وێ دەمی گەش بی شیشا دلێ من

---

[1] ترسوو.

[2] (لاشا، لاشە) پەیڤەكا فارسیە و ڕامانا (كەلەخ) ددەت.

[3] ئەز.

خوزی ل وی عەمری و چاخێ[١] ئە[٢] ڕاڤکەر
ل شاخ و گەلیا گەڕام سەرانسەر

جانەوەر هەمی ئەشکال و ئەرناك
مە کوشتن گەلەك خڕاب و هەم چاك

لەذەت و خۆشی مدیتن[٣] گەلەك
خاسما[٤] نێچیرا سەر لاتا بەلەك

یان ل گیبەحنێ یان ل ئافرۆکی[٥]
یان ل خامتوورێ ل سەری بیرۆکی

یان ل زاویتە یان ل مازکێ
یان ل منینێ یان ل بانکێ

یان ل سویارا هنداڤ شلیونێ
یان ل ئاصوصێ سەرێ ڕەشیونێ

یان ل کاتوی و طەنگا شکەتوکا
نێچیرا ڤانا هەر وەختێ کوکە

یان ل بویتەلما و یان ل شیڤ دێمێ
ئافرێ دەروکی و بەران بەرگێمێ

یان چیا ڕەشکی و گرێ عەزمانا
ل ڤان هەر دووا نێچیر ترخانە

---

(١) ل جهەکێ دیتر: دەمێ.

(٢) ئەز.

(٣) من دیتن.

(٤) نەخاسمە، ب تایبەتی.

(٥) ژ ڤێرێ پێڤە باراپتر باسێ چیا و گوندێن سنوورێ دەڤەردارِیا زاخۆ دکەت.

یــان كـــۆیێ شیشــێ یــان ئاڤــا گیــوزێ
ژ كـــەیفــا هـــەردەم تـــوێ لـــەیـــزێ

یـــان گێمكـــا و ســـەرێ گـــەزینكـــێ
چـــالكێ ئاصوصـــێ چ كـــەو ڕەڤینكـــێ

یـــان ل بێخیـــری لـــرەزكـــێ مـــەتـــێ
ژكـــەیفـــا هـــەردەم دێ كـــێ داوەتـــێ

یـــان ل ئالێشـــكێ و قوبـــا مـــەیموینـــا
یـــــان ل شـــــــردێ وان وار و شـــــــوینا

ل حـــــەفطـــــەنـــین و دۆلا كورانشـــــێ
ل عـــــەجـــــەمیـــا ل ڕەخ شـــــەرانشـــــێ

ســـەرێ بلـــەكـــش چـــەن مـــەســـەب خـــوەشـــن
كـــەوگیـــر هـــەردەمـــێ ل وێ دلگـــەشـــن

مـــــراڤ[1] وا كـــــــری لگـــــــەك دەرا
ل دەشـــت و زۆزانـــا ل گـــەلـــی و ســـەرا

یـــان ل پیـــرس و یـــان ســـری و صـــادا
یـــان ل هـــەشـــتكا یـــان لاتـــا مـــارا

ســـــەرێ بوســـــێلێ یـــان كانیـــا تـــۆزێ
هـــەردەم مـــەســـەبـــا تـــو دێ ڤـــە دۆزێ

مراڤـــــا[2] كـــــری ل ڤـــــان دەڤـــــەرا
گـــەلـــەك ڕازامـــە ئـــەز ل بـــەر بـــەرا

---

(١) مه ڕاڤ.

(٢) مه ڕاڤا.

هـــەم ل ئـــەشـــكەڤتـــا و هـــەم ل چـــالا
ل ســــــەرێ بلّنـــــد و زكــــێ نهـــالا

ل دێمســـــتان[1] و ل ســــــەر كانيـــــا
ل ڕێلســـــتان[2] و ل ســـــەرێ چيـــــا

---

[1] ئەردێ هشك و بێ ئاڤ.

[2] ئەردێ تێر گيا.

## مالا شێخ ڕەقیب[١]

مـــالا شـــێخ ڕەقیـــب ئـــەو پێـــنچ برانـــە
هـــەر پێـــنچ گـــەوهـــەرن وەکـــی چرانـــە

ئـــێ[٢] مـــەزن فـــەخـــری[٣] شـــێخێ ب دیانـــەت
ژبوونـــــا دینـــــی زۆر ب عینایـــــەت[٤]

ئێـــدی[٥] صـــابرە ســـەرێ ســـەرۆکـــە
بـــۆ هـــەمـــی شـــوولا ئـــەو زۆرێ کوکـــە

ئێـــدی[٦] شـــەفیعـــە وەك مـــن ڕاڤکـــەرە
ڕاســـت و درســـتە ئـــەو چـــی ســـەرووەرە

ئێـــــدی[٧] نامقـــــە زووری ڕەزینـــــە
چـــی شـــێرە مێـــرە چ ســـەر هلینـــە

ئێـــدی[٨] ناظمـــە برایـــێ پـــوڕ[٩] شـــەنـــگ
ل نـــاڤ عـــەشـــیرا ب نـــاڤ و ب دەنـــگ

---

[١] شێخ ڕەقیب موحەمەد سۆرچی، سەرۆك هۆزێ سۆرچیان، ل سالا (١٨٧٥)ێ هاتیە ل سەر دونیایێ، ناڤبری ب مەرداتیێ یێ ناڤدار بوو، ل سالا (١٩٥٣)ێ مالئاڤایی کر.

[٢] ل جهەکێ دیتر: یێ.

[٣] شانازی.

[٤] چاڤدێری.

[٥] ل جهەکێ دیتر: یێ دی.

[٦] ل جهەکێ دیتر: یێ دی.

[٧] ل جهەکێ دیتر: یێ دی.

[٨] ل جهەکێ دیتر: یێ دی.

[٩] ل جهەکی دیتر: پڕ.

وەکـــی شـــەکـــری زۆری شـــرینە
ژبـــۆ مێهڤانـــا ئـــەو ســـەر هلینـــە

چ صـوحبەت[١] خـوەشـە ئـەزمـان شـرینە
بـــرا چ بێـــژم وەکـــی هنگڤینـــە

ئـەگـەر تـە بڤێـت خۆشـیێ ببینـێ
دڤێـت هـەردەمـێ دگـەل وی ڕوینـێ

نـەخاسـمە بـۆ مـن بـرا لـەوەنـدە
چ خـۆش مرۆڤـە و چ بـاش و خـەنـدە[٢]

ئـەگـەر بگـەرێ و هـەر ب جـەمینـێ
وەکـی ڤـان بـرا تـو قـەط[٣] نـابینێ

بـــابێ وان ڕەقیـــب ل کوردســـتانێ
نـــابن وەکـــی وی ل دەســـت و دانـــێ

بـابێ ڕەقیبـی شـێخ موحـەمـەد بـوو
تـەکیا بجێلـێ[٤] زۆرا ب وەصـفەت[٥] بـوو

ئـــەو ژ ذڕیـــەتا[٦] شـــێخێ گولـــەکـــە
ل نـاڤ مـە کـوردا وی نـاڤ گـەلـەکـە

---

[١] ل جهەکی دیتر: سوحبەت.

[٢] (خەندە) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (گرنژین و کەنی) ددەت.

[٣] ل جهەکێ دیتر: قەت.

[٤] ناڤچەداریە سەر ب دەڤەرداریا ئاکرێ.

[٥] سالوخەت.

[٦] دویندەهـ، کنێت.

حاتـەم[1] چـو جـارا ناگـەهـت ئـەوان
بـــۆ مــــەردینیـــێ خۆلامــــە بـــۆ وان

وان دەســـــتێ درێـــژ دانــــێ هــــەیـــە
دانـــا ئــــەڤــان ژ خـــەلكــێ زێـــدەیـــە

وان نـەفس بچویكـە هـەرن ڕووگـەشـن
دگـەل دۆسـتێ خـۆ دائـیم ڕوو خـوەشـن

حـەتـا[2] ئـەز بمـرم ئـەز وان ژبیـر نـاكم
ب براتیـــا وان ئـــەزێ خـــوە شـــاكم[3]

مـەیـلا وا دگـەل مـن یـا ب تـەمامیـە
براتیـــا وان بـــۆ مــــن ب ڕاســـتی یــــە

نـە وەك هنـدەكـا ب سـەرێ ئـەزمـانی
بـــەلـــێ ددڵـــدا وەكـــی شـــەیطـــانی[4]

ژ مــــن عـــاجزن چنكـــی مــــەلا مــــە
ئــــەگـــەر بـــاخڤم بــۆ وان بـــەلا مـــە

دێ ڕاســــتیێ بێـــژم ل هــــەمـــی عـــەردا
چنكـــی گـــەلـــەكـــا نـــامووس ل دەردا

بـــلا دوعـــا كـــن ئـــەهلـــێ ئیمـــانێ
بـــۆ شـــێخ ڕەقیبـــی و ڤــێ خانـــەدانـــێ[1]

---

(1) حاتەم تائی عەرەب، ئەوێ ناڤدار ب مەردینیێ.

(2) ل جهەكی دیتر: هەتا.

(3) شاد و كەیفخوەش كم.

(4) ل جهەكی دیتر: شەیتانی.

مالەکا کوردا مالا ڕەقیبی
برا تو دزانێ ما تو غەریبی

ڕەها مرۆڤی ئەگەر ئەصلی بت
بێگومان مرۆڤ هەر دێ ڕووسپی بت

مە هێڤی هەیە خودا یەزدانە
هەرا ب دەوام بت ئەڤ خانەدانە

چنکی فایدەیە ژبۆ هەژارا
لێ کۆم ڤەدبن ل هەمی کەنارا[٢]

بۆ مە هەمیا باشن ب خاص و عامی[٣]
سوودێ[٤] ژێ دکن هەمی ب تەمامی

من هێڤی هەیە ژ یەزدانێ مەزن
عەمر[٥] درێژ بن هەمی دۆستێ من

---

[١] خودان بنەماڵە.

[٢] ڕەخ، ئالی و لا.

[٣] تایبەت و گشتی.

[٤] (سوود) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (مفا، قازانج) ددەت.

[٥] ل جهەکی دیتر:

## گۆفتوگۆ دگەل جەگەرخوینی

س- دە گوهــــدن گۆتنـــا ســــندی و

جــەگـــەرخـــوین و ئـــەڤـــێ قیلـــێ[1]

کــــۆ دەربییــــە ژ دینــــێ خـــوە

قـــەبـــوول ناکـــت چـــو تـــەئـــویلێ[2]

نییـــــــە بـــــــاوەر ب قورئـــــــان و

ب تـــــــــــەوارت و ب ئنجیلـــــــــــێ

ج- ئـــــەزم پیـــــرێ موغـــــان[3] ئیـــرۆ

تـــو گوهـــــ دێـــرە ل تـــەفصـــیلێ

چکــــــم ئیـــــرۆ ب تـــــــەوڕات و

ب قورئـــــــــان و ب ئنجیلـــــــــــێ

س- حـــەچـــی ئیـــرۆ خـــۆ کـــافر کـــت

نییـــــە کـــــەس بێژتـــــێ لامـــــا

بـــۆ وە چـــاخێ کـــەســـێ بـــێ دیـــن

لـــــــەعـــین و پـــــیس ل کامـــــا

شـــەرم نـــاکی جـــەگـــەرخـــوین و

ببێـــــژی تـــــو نـــــە طەهـــــا[4] مـــــا

---

[1] گۆتن، ئاخفتن.

[2] شرۆڤەکرنێ.

[3] موغان بۆ مەزنێن ئایینی یێن زەرەدەشتیان دهێتە هژمارتن.

[4] تەها ئێک ژ ناڤێن موحەممەد پێغەمبەرینە (س).

ج- نـــه مووســـا مـــا نـــه عيســـا مـــا

نــــــه زەردەشــــــــت و طاهـــــا مـــــا

كــــــوفر نينـــــــه د ڤـــــــى وەختــــــى

ب حـــــوكمێ صــــەرف و تــــەحــــويلێ

س- هــەمــى تشــت حــادثن[١] غــەيــرى[٢]

جـــــــەنـــــــابێ ذاتـــــــێ ڕەحمـــــــانى

ئـــەگـــەر بـــاش تـــە ب مـــەيزينـــێ

ب عـــــەقلـــــێ خـــــۆ تـــــو دێ زانـــــى

تـــەســــەلســـــل[٣] نينــــه يـــا مــــونكر

كـــــو ئيثباتـــــــــه[٤] ب بوڕهــــــانى[٥]

ج- نــه هـــن[٦] پێشـــى نــه هـــن پاشـــى

حــــدوث[٧] و هــــەم قيــــدەم[٨] كــــانێ

ژ عالـــــەم را نـــــه هـــــن شاهــــــد[٩]

ب صــــــريف[١٠] و ب تــــــەبــــــديلێ[١١]

---

(١) بويەرن.

(٢) ژبلى.

(٣) دويڤ ئێك.

(٤) سەلماندن.

(٥) گرۆڤ.

(٦) نە هند.

(٧) بويەر.

(٨) كەڤنار.

(٩) ديدەڤان.

(١٠) دەنگێ پێنووسى، دەنگێ دەرگەهى.

(١١) گوهۆڕين.

س- هـــــزار داغ ل دلـــــێ مــــن تـــــو
ببـــێ كـــافر ئـــەیـــا ســـەیـــدا
حســـــاب كـــێ تـــو طـــەبیعـــەت[١]
خـــالقێ[٢] كـــەونییـــە كـــر پـــەیـــدا
طـــــەبیعـــــەت نینـــــە خـــــالق بـــــت
كـــو مـــەخلـــوقی[٣] بكـــت پـــەیـــدا

ج- ئـــەگـــەر خـــالق هـــەبـــا كـــەنگـــی
بـــــەلـــــەنگـــــاز دبـــــوو پـــــەیـــــدا
طـــــەبیعـــــەت خـــــالقێ ڕوحـــــێ
موجـــەســـەم[٤] نـــۆری قـــەنـــدیلێ[٥]

س- تـــو چـــێ بـــووی ژ ئاڤـــا ڤێـــك
كـــەتـــن هـــەر دوو كـــو بـــبن مـــەوجـــوود
تـــو نەهـــ هـــەیڤـــا دنـــاڤ ڕەحمـــێ
تـــەمـــام بـــووی ئـــەوە مـــەوعـــوود[٦]
ئـــەڤـــە كفشـــە[٧] ل نـــك هـــەر كـــەس
خیـــالێ تـــە هـــەمـــی مـــەردوود[٨]

---

[١] سالوخەت.

[٢] چێكەر.

[٣] خەلك.

[٤] ئاشكرا كرن.

[٥] ڕۆناهیا چرایی.

[٦] سۆزدای.

[٧] دیار و ڕۆهنە.

[٨] پەسەند نەكرن، ڕەتكرن.

ج- کێ یە خالق کێ یە ڕازق
کێ یە مەعبوود[1] کێ یە مەشهوود[2]
دوو صەد ڕوح ل قدس بیتن
ژ شەکێ نابێ تەبدیلێ[3]
س- تەماشاکە ل دۆرێ خۆ
ل هەمی تشتا ل دونیایێ
بنێرە کویر ب عەقلێ خۆ
قەط[4] تشتەك بێ خودان[5] نایێ
گرفتاری ل دۆنیا خۆ
پەشێمانی ل عوقبایێ[6]
ج- بەسە ئەی عالمێ نازان
تەماشا ناکی[7] دونیایێ
ب ڤێ کەڕێ[8] ب ڤێ دەورێ
ب ڤی تەصویر و تەمثیلێ[9]
س- ل سەر ڤێ دینێ ئیسلامێ
گەلەك توند و گەلەك هاری

---

(1) خودێ (ئەوێ عیبادەتی بۆ دکەن).

(2) هاتی دیتن، ئەوا هاتی دیتن.

(3) گوهۆڕین.

(4) ل جهەکێ دیتر: قەت.

(5) ل جهەکێ دیتر: بێ خودا.

(6) دویماهی، داوی.

(7) ل جهەکێ دیتر: تەماشا کی.

(8) ب ئەڤێ جارێ.

(9) ب ئەڤی وێنەی و ب ئەڤی شێوەیی.

نەیاری بۆ عەقیدا[1] دین

ژبۆ کۆ فرێ تو هاوکاری[2]

د حەقێ ذاتێ باری[3] هەم

دوڕندە و وەك ئەوی هاری

ج- حەچی تشتێ ئەصل نینە

چما پوڕ ژێ خەبەر داری[4]

تو ڤی تشتێ قە ناس ناکی

بتکارا[5] ڕوو ب تەحصیلێ[6]

س- ب ئەمرێ[7] خالقێ کەونی

کوڕێ عەردێ ژێ چێبوویە

بڕەك[8] هزرا خۆ ناکەی تو

یەکێ دی وەك تە دین بوویە

تو ب وی تەلمیزی[9] ئبلیس

ژ ڕیا ڕاستی کو دەر بوویە

ج- هەمی عالەم ژ یەك نوقطە

موحەقەق[1] ئافەرین بوویە

---

(١) بیروباوەری.

(٢) هاریکاری، ژ زاراڤێ سۆرانی هاتیە وەرگرتن.

(٣) خودایێ مەزن.

(٤) (داری) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (هەیی) ددەت.

(٥) (بەتکار یان بەدکار)، پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (خراپکار) ددەت.

(٦) دەستڤەهینان.

(٧) ب فەرمان، ب دەستویر.

(٨) پیچەك.

(٩) شاگرد، خویندکار، قوتابی.

کـــی یـــه کـــافر کـــی یـــه مـــؤئمن
ســــــەرا ب حـــــوکمێ تـــــەدلیلـــــێ

س- دەمــــــێ بـــــووری ل موســـــلمانا
هـــــەمـــــی خۆشـــــی و طاعـــــەت بـــــوو

نهـــو ئـــــەم ب کـــــول و دەردیـــــن
ژ بـــێ دینـــی نـــــه بـــــەرهـــــەم بـــــوو

بزڤـــــڕە تـــــو ژ کـــــوفرا پـــــیس
هـــــەمـــی عـــومرێ تـــه تێـــر غـــەم بـــوو

ج- بزانــــــه ئـــــەڤ دەهـــــێن بـــــووری
حـــــەتـــا ئیـــرۆ جـــەهـــەننـــەم بـــوو

ئـــەگـــەر بگـــەهـــین مـــەریخـــێ ئـــەم
بهـــــەشـــــته مـــــەزهـــــەبـــێ قیلـــــێ[2]

س- وەکـــی تـــه قـــەط[3] نـــه مـــونکر[4] بـــین
جـــــەزیـــــری[5] و حـــــافظێ شـــــیراز[6]

جزیـــــری گـــــۆت هـــــو المعبـــــود[7]
هـــــو المشـــــهود[8] تـــــو وێ ئـــــێ شـــــاز

---

[1] ب ڕاست و دروستی.

[2] گۆتنێ

[3] ل جهەکێ دیتر: قەت.

[4] ئینکار نەدکر،

[5] مەلایێ جزیری (١٥٧٠-١٦٤٠ز).

[6] حافز شیرازی (١٣٩٠-١٣٩٠ز).

[7] واته (خودێ ـ ئەوێ عیبادەتی بۆ دکەن).

[8] واته (هاتی دیتن، ئەوا هاتی دیتن).

د قورئانێ هەیە تەئویل

تو سەرشوور و نە سەر ئەفراز

ج- وەکی من گۆتنە پیرێ

جەزیری و حافظێ شیراز

مەریخێ وان تەماشاکە

مەکە باوەر ب تەئویلێ[١]

س- د بەحرا غەم غەریقم[٢] ئەز

کو ئیرۆ بێ سەر و سەودا

دبینم عالمێ زۆر باش

ئەوان ئەخلاق دبن بەردا

دبینێ فەیلەسوفن ئەو

بەلێ مرنە ژ کول و دەردا

ج- جەگەرخوین چوو ژبەر دەردا

مە دین و هەم جیهان بەردا

نکارم ئەز یەکێ بگرم

ب تەرجیح[٣] و ب تەفصیلێ[٤]

س- هزار داغ ل دلێ سندی

مەلایێ باش بین کافر

جەگەرخوینی دبینم ئەو

هزرمەندە و گەلەک ماهر[١]

---

(١) شرۆڤەکرن.

(٢) خەندقی.

(٣) بلندتر.

(٤) ب درێژی.

بەلێ ل ئالێ خۆدێ ناسی
ب گورەیی ظاهڕی[٢] کافر
ل سەر ڕێ و ڕەوشتێ پیس
دزانم کو جەگەرخوین مر
تەمەڕود[٣] کر ل دینی لەو
گەلەك مۆشتاقی[٤] تەبدیلێ[٥]

س- ئەگەر ئەز بچمە بەیدایێ
ببینم باغەکێ تازە
دناڤ ئاڤایە قەصڕەك خۆش
دگەل دەنگێ دەف و شازە
ئەزێ هەر وێ دەمێ زانم
خودان شەه میر و شەهبازە
قیاسکە تو ئەڤی کەونی
ل سەر ڤێ قصێ[٦] یا ڕازە
ئەگەر صانع[٧] نەبا کەنگی

---

(١) شەهرەزا.
(٢) سەرڤە.
(٣) پشترێ کەڤت.
(٤) حەز.
(٥) گوهۆڕین.
(٦) گۆتنێ.
(٧) چێکەر، دروستکەر.

وجودت[١] هاته تەحصیلێ[٢]

س- ل سەر دینێ فورویدێ[٣] توو

موبارەك بت ل تە سەیدا

ب وی پەیڕەوێ دا ڕویین

چ حالەت بوو ل تە پەیدا

تووی موشتاقێ[٤] لینین[٥]

تەدەست ژ دینێ خوە بەردا

بزانە باش ئەڤ هەر سێ

گەلەك پیس ل نك مەردا

دگەل ڤا[٦] پیسێ کوفرێ

تو هەر سەرشوور و سەر خویلێ

---

[١] هەبوونا تە.

[٢] دهاتە ب جە.

[٣] ل جهەکێ دیتر: فیروری.

[٤] حەز.

[٥] فیلادیمیر لینین (١٨٧٠-١٩٢٤ز).

[٦] ل جهەکێ دینر: ئەڤان.

## پێنج خشته ل سەر هۆزانا یووسفی[١]

سندی:

سەحەر گاها دنالم ئەز
دەما دلبەر ل بەر هەستا
ل بەر عەکسا[٢] ڕۆی جانێ
ل ئەڤێ من وضو[٣] بەستا[٤]
دەما زانی کو پێڤیێ[٥]
طەوافێ مە چ زوو هەستا

یووسفی:

کەتم بەندا ئەڤینێ نوو
مە زوو پشت و کەمەر بەستا
مە سەر دا بەر دەرێ یارێ
ڤەوەستام[٦] دەست ل سەر دەستا

سندی:

چ لەرزیم ئەز دەما من دی
شەهنشاها مەقام[١] بەرزە[٢]

---

[١] ڕەنگە مەلا مەحموود یووسفی هەلبەستڤانێ ناڤدار بیت.

[٢] (عەکس) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (وێنە) ددەت.

[٣] دەستنڤێژ.

[٤] (بەستن) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (گرتن) ددەت.

[٥] پێدڤیە.

[٦] ڕەواستام.

تە مەیدانا بەلەك ئەنیە
چ ڕەند و خۆشك و ب طەڕزە[٣]
ڤە چەن[٤] صالن ل ڤی ئال
کو من چەن[٥] ماچی لێ قەرزە

یووسفی:

ب پێلێن کەهربائی دل
دگرتی جەزیە ئو لەرزە
لەزان بێهتر ل لێدانێ
دەما دلبەر ل بەر وەستا[٦]

سندی:

ب بەژن و قامەت و کێسم
ئەوان لێڤ و ڕووی پۆڕ گەش
ب بەخچەی سینە ئو گەردەن
ب لورێ ئەز کرم سەرخوەش
چ حەقە ئەز ژ وی بەخچەی
بهەشتێ کو ببم بێ بەش

یووسفی:

ب سحر و ئاورێن چاڤا
ب دێم و زلف و پۆڕا ڕەش[١]

---

[١] پلە و پایە.
[٢] بلندە.
[٣] ل جهەکێ دیتر: ب تەڕزە.
[٤] ئەڤە چەند.
[٥] چەند.
[٦] ل جهەکێ دیتر: هەستا.

ڤەوەستا من ب داوا دەو
لەتێ گرت و ژنۆ هەستا

سندی:

مە دەستێ وێ ب طرپس[٢] گرتو
مە گۆتێ[٣] هەر تو وێ صۆرگول
دناڤ بەخچەی ئەڤینێ سند
ییە بۆ تە کو هەر بولبول
چقا پەسنێ وێ من گۆتن
دگەل وێ قەط[٤] نەدا من مل

یووسفی:

ب هەر دوو دەست لەرزین
مە دەستێ وێ کشا بەر دل
مە سۆزەك ژی دخوەستی
لێ چقا هاتم مە ژی فەستا

سندی:

کەتم طەلیا[٥] ئەڤێ جانێ
گەلۆ دێ دەرکەڤم جارەك
مە دی هلبوو ژ لەعلین وێ
چ پێت[٦] و نور و هەم نارەك[١]

---

(١) ب دێم و کەزی و پرچا ڕەش.

(٢) ب ترپس.

(٣) ل جهەکێ دیتر: مگۆتێ.

(٤) ژ من.

(٥) تەلیا، تەلهە، داڤ.

(٦) ئاگر.

کول و دەردا ل من هلدان
ژ مڕا [2] کوم بوونە عنبارەك[3]

یووسفی:

ژ داڤا بسك و کەزیا زوو
تو من بەردە بدە جارەك
ژ ئاڤا هەر دو لێڤا یەك
قدەح[4] مەێزی ل سەر مەستا

سندی:

فرشتێ من ژ ئەبرۆیان بری
دوو صەد تیرو چ حال طەنگم[5]
ب من خۆشە برینداری
ب ڤێ نرخێ[6] کو بێ دەنگم
چما پیتە[7] ب من ناکی
تو نابینێ چ بێ چەنگم

یووسفی:

بریندارم ژ وا[8] چاڤێن
د ڕەش بێ دەنگ و بێ ڕەنگم

---

(1) ئاگر.

(2) ل جهەکێ دیتر: ژ مەڕا.

(3) ل جهەکێ دینر: عەمباك.

(4) پەرداغ، گلێس.

(5) تەنگم.

(6) (نرخ) پەیڤەکا فارسیه و ڕامانا (بها) ددەت.

(7) پویتە، گرنگی.

(8) ل جهەکێ دیتر: وان.

حــــەچـــى ڕەنگـــێ مـــە مـــەيزينـــى
ئـــــەوێ بـــێ دى هـــــەڕە خـــــەســـــتا

ســـــندى:

مـــە دەردا مـــــەرگـــــەكـــــى[١] جـــانى
دگــــەل دلبـــەر نـــەچـــووم گـــەشـــتێ
چڤـــــا ئـــــەز ڤـــــەدكـــــم ڨـــــالێ[٢]
ل مـــــن طـــــالع[٣] ڨـــــەوى ڕەش تـــــێ
وەكـــــى ديـــــن هۆڤـــــا ئـــــەد ســـــۆڕم
ل ســـــەر كوهـــــان[٤] و هـــــەم دەشـــــتى

يووسفى:

چمـــــا ئـــــەى يووســـــفى ئێـــــدى
نـــەمـــا خـــوەنـــدن[٥] ل تـــە خـــوەشـــى
شـــــەڤ و ڕۆژا دچـــــێ ئـــــۆ تـــــێ
ل ڤـــــان ڕووبـــــار و هـــــەم دەشـــــتى

---

[١] مرنێ.

[٢] ئاخڤتنێ.

[٣] شانس.گجح

[٤] (كوه) پەيڤەكا فارسيە و ڕامانا (چيا) ددەت.

[٥] خوارن.

## پێنج خشته ل سەر هۆزانا ڕاجی

سندی

کـــەجـــا کرمـــانج ببینـــەم ب نهێنـــی
تکایـــە[1] ل گـــەل هـــەڤـالێ خـــۆ تـــو ڕوینـــی
هـــەجـــی تشـــتێ هـــەیـــە ل دل دەرینـــی

ڕاجـی

کـــەجـــا کـــوردی وەرە داتـــو ببینـــی
تـــو پـــەردا ل ســـەر هـــەڤـدوو هلینـــی

سندی

چـو عـەقـل و هـۆش ل گـەلێ مـن نـەمایـە
ب ڤـــی نرخـــێ ژیـــان ل مـــن جـــەفایـــە[2]
هـــەژارم قـــەط[3] چـــو هێـــز ل مـــن نـــەمایـــە

ڕاجـی

ل مـــن ئاقـــل ژبـــەر ڤـــێ پـــوڕ[4] نـــەمایـــە
نکـــارێ ئـــەو چ تشـــتی ژەڤ[5] دەرینـــی

---

(1) ئاگەهداری.

(2) دلڕەقی.

(3) ل جهەکێ دیتر: قەت.

(4) پڕ، گەلەك.

(5) ژ هەڤ.

سندی

ئـــەڤ ژینـــا عـــەزیـــز و خـــۆش م[١] بـــووری
هلنگڤـــتن ل جـــونێ شـــوبهی[٢] كـــووری
ل تـــە قۆناغـــەكـــا ســـەنگـــە تـــو دووری

ڕاجـی

نـــەمـــا ژەڤ[٣] نـــاس بكـــێ مووســـا و نـــوری
نـــەمـــا ل حـــەدی دناســـێ ئـــەو ژ ئینـــی

سندی

دخـــوازی تـــو كـــول و دەردا[٤] تـــو دەركـــێ
كـــەڕ و گیـــژێ نـــەشـــێ تـــو چـــارەســـەركـــێ
ئـــەرێ چـــاوا تـــو دێ مـــەتنـــا[٥] ژبـــەر كـــێ

ڕاجـی

دچـــێ دا ئـــەلفـــێ بینـــی ژبـــەر كـــێ
تـــە دی ڤایـــە كـــو مـــەقصـــووری[٦] دخـــوینێ

سندی

ئـــەز و ڕاجـــی دچـــوون دێـــرا بـــەڕانـــی
پـــەری زادە چـــی جهـــێ وی مـــە نـــەزانـــی
ئـــەوا چـــاڤێن د ڕەش سین[١] مێـرگ و كـانی

---

[١] من.

[٢] مینا، وەك.

[٣] ژ هەڤ.

[٤] ل جهەكی دیتر: داغا.

[٥] نڤیسین و ناڤەڕۆك.

[٦] كورتی.

ڕاجی

تــه دی گــو[2] دێ هــەرم دێــرا بــەڕانــی

تــه هــەو دی ل بــەڕۆشــکێ[3] وێ بینــی

سندی

نــەخۆشــم ئــەز جــوانێ هنــد بێــژی

ئومێــد مــن کــو گوفتــەك تــو بڕێــژی

تــو دوختــورێ ب ئــەقلــی تــو نــه کیــژی

ڕاجی

دچــــم دختــــوری دا دەردم ببێژنــــێ

سـەماعـا خـۆ ل سـەر سـینگێ مـه دێنـێ

سندی

دبێــژت هــیچ نــەمــا بــۆ تــه چ کــارەك

دلــێ تــه تــم کولــه وێ تێــده خــوارەك

تــه پیــرۆز بــت کــو ئــەڤ دەرده موبــارەك

ڕاجی

دبێــــژی دل برینــــدار ب جــــارەکــــی

د ڤــێ دەرمانــەکــی زوو ژێــره بینــی

سندی

چ نــوژداره ئــەڤــێ ئێشــێ ژ مــه ڕاکــێ

کچــا کــوردی تــو هــەر دختــوره چــاکێ

د کــارێ تــو هــەمــی دەردا دەواکــێ

---

[1] سینگ.

[2] گۆت.

[3] بەڕۆشکا ناڤ دۆسکیان.

راجی

چ دەرمانــــە کـــو ڤـــی دەردی بـــەلاکـــێ
ئـــەڤـــە دەردێ مـــەزن دەردێ ئـــەڤینـــێ

سندی

ب ڤـی دەردی گـەلـەك چوون و ئـەمێ[1] چـین
ب ڤـــی دەردی مـــرن هشـــیار و نســـرین
یـەقـین ئـەڤ دەردەیـە بـێ کـەرب و بـێ کـین

راجی

ئـەڤـە دردێ کـو پـێ چوونـە مـەم و زیـن
ئـــەڤـــە ئـــەو بـــۆ ل فرهـــاد و شـــرینێ

سندی

ب ڤـی دەردی مـرن عوشـاق[2] و سـەرمـەنـد
ئـــەڤینـــدارین جـــەحێـــل و نۆبـــەر و ڕەنـــد
وەکـێ غیلمـان و حـورێ دەڤ خـەن و قـەنـد

راجی

ئـــەڤـــە دەردێ خـــەجـــا دوت و ســـیامەنـــد
ئـەڤـە دەرێ کـو هـەر کـەس پـێ نـەمینـێ

سندی

هەیە ئێك بۆ مە ڤی دەردی کو حەلـەکێ[3]
ڤـەکـت سینە ل سـەر دەرمـانی گـەلـەکێ
مـەگـەر بێـژی ئـەڤـین دارا لائـەلـەکێ

---

[1] ئەم دێ چین.

[2] ئەڤیندار.

[3] چارەسەری.

ڕاجی

ئەڤی دەردی گەلەك كوشتن ژ خەلكێ
دزانم دێ مرم پێڤێ[1] برینێ

سندی

گەلۆ ما دێ هەبت جارەك ژ بالە
شەڤ و ڕۆژی م[2] هەر ئەو جان خیالە
شەهین شاهە چ شوخ و چ شەپالە

ڕاجی

بەلێ دەرمان لبا نازا دەلالە
د ڤێ دەستێ خۆ سەر جانێ مە دەینێ

سندی

خودی ناسكە عەزیز و ئەڤسەرا من
پچەك ڕەحمێ برێژە گەوهەرا من
تو راوەستە ل هەمیشەل هنبەرا من

ڕاجی

ژ یەزدانی ب طڕسە[3] دلبەرا من
د ڤێ عاشق ژین سجدی دەرینی

سندی

تو چەن ماچا ل لێڤێ ئال بدی وی
قەضاكە ئەو قەڕی[4] پێڤی[5] ژیۆ وی
كو دا ساخ بن برینێ ل سەر دلێ وی

---

(1) ب ئەڤێ برینێ.

(2) من.

(3) ل جهەكێ دیتر: تڕسە.

(4) ئەوی قەڕی بدە.

(5) پێدڤی.

راجی

هنـــەك ئاڤـــا دەڤ و لێڤـــا بـــدی وی

دە تـــەعزیمـــێ ب وی پێڤـــە بخـــوینی

سندی

ژنـــو ســـــندی دناســـــت ڤـــا[١] دەلال

د کـەیڤـێ کـە دگـەل ئاسـك و غـەزال

تــە پیــرۆز بــت ژبــۆ تــە خۆشــی مــەجــال

راجی

ژنوکـــا یووســـفی ڕەنگـــێ هـــەڤـــالا

ل حـــــوجرێ دێ ب هشـــــیاری بمینـــــی

---

[١] ئەڤان.

## دوڕا قیمەت گران

وەردەکا گۆلا[1] ل وانێ
تو دوڕێ قیمەت گرانێ
حەکیمێ شوبهی لوقمانێ
من هەر و هەر ئەو ڕەفیق[2]

من هەر و هەر ئەو هەڤالە
شەڤ و ڕۆژ دائیم ل بالە
ئاسکا گەردەن ب خالە
ڕەش ڕوحانا پور عەمیق[3]

ڕەش ڕوحانا ل سەر دەراڤ
عەنبەرا ڕیشی بەلاڤ
هەر سەحەر بێهن چو هناڤ
قوطیا[4] مسکا ڕەحیق[5]

قوطیا مسکا ب فالێ
قەمەر ل باغێ جەمالێ
گەر تو شەمعێ وەر شەمالێ
ئەز عەجێب سۆتم حەریق[1]

---

(١) دەریاچە.

(٢) هەڤال.

(٣) کویر.

(٤) قوتیک.

(٥) مسکا سافی.

ئـــەز عـــەجێـــب صـــۆتم ب نـــاری[٢]
شـــەڤ و ڕۆژ مـــن ئاهـــــ و زاری
ڕاحـــەتـــی نینـــە چـــو جـــاری
هـــەر وەکـــی بـــورقێ بـــەریـــق[٣]

هـــەردەمـــا بورقـــا ڤـــەدابـــوو
ڕوح ژ لاشـــێ[٤] مـــن جـــودا بـــوو
صـــەد مـــەدەد هـــاوار خـــودا بـــوو
ئـــەز دخـــوونێ بـــووم غـــەریـــق[٥]

ئـــەز غـــەریـــق بـــووم لـــەو دنـــاڤێ
بـــێ هشـــم هـــەردەم و گـــاڤێ
وێ دەمـــێ ل مـــن کـــت سـلاڤێ
دی ڤـــەژینـــت مـــن ڕەفیـــق[٦]

دی ڤـــەژیـــم دەت مـــن مـــەجـــالێ
مـــا چ بکـــم لـــەب لـــەعـل[٧] و ئـــالێ
دانـــە دور گـــەردەن ب خـــالێ
ئیـــرۆ وی گۆتـــە مـــەنیـــق[٨]

---

[١] ئاگر.

[٢] ئاگر.

[٣] تەیسین، جەیسین.

[٤] (لاش) پەیڤەکا فاارسیە و ڕامانا (کەلەخ) ددەت.

[٥] خەندقین.

[٦] هەڤاڵ، دوست.

[٧] (لەب لعل) پەیڤێن فارسیە و ڕامانا (لێڤ سوڕ) ددەت.

[٨] ئالۆز.

ئيـــرۆ وێ چـــاڤ ل مــــن بـــادا
پـــەردەيـــا شـــەرمــــێ ڤـــە لادا
گـــورەرێ  ل مــــن كريـــە جـــادا
وێ ڤـــەكـــر بـــۆ مـــن طـــەڕيـــق[1]

وێ ڤـــەكـــر بشـــگۆژى ســـينە
زەخمـــە هـــەر موشـــێ ژ جينـــە
گـــو[2] وەرە لالـــم تـــو زێونـــە
مـــەجلســـا[3] خـــۆ شاشـــەپيـــق

مـــەجلســـا ئـــەم هـــەر دوو تێبـــين
بـــێ گومـــا دى شـــۆل ڤـــەڕێ بـــين
نـــە وەكـــى پێشـــى بـــەرى بـــين
ژێـــك بمێـــژين ئـــەم رەحيـــق[4]

دەڤ و لێــــف وەك هنگڤينـــــە
شـــەكـــر و شـــەهـــدا شـــرينە
ڕوح و جـــانى نـــــۆڕەدينــــە[5]
هـــەڤ ســـەرە بـــۆ مـــن ڕەفيـــق[6]

---

[1] ڕێك.
[2] گۆت.
[3] جڤات.
[4] سافى.
[5] نورەدين، هەلبەستڤانێ ئەڤێ ديوانێ.
[6] هەڤال، دوست.

## ئای بۆ خۆشیا لاوینێ

ئـــای بـــۆ خۆشـــیا چـــاخێ لاوینـــی
لاوینـــــی ڕوونـــــه ژبـــــۆ ڤـــــەژینـــــی

چـەنـد خۆشـه عشـقا بـەری گونـدیانی
کـەکچـه کـورده چـو بـوو سـەرەکانی

جـــەرێ ئامێـــدی ل ســـەر ملـــێ وێ
چب چـب ئـاڤ د ڕشت بۆ سـەر بسکێ وێ

بشـکۆژێ زەخمـەی ل سـەر مـەمکـه
هـــزار عـــەلمـــودا تـــو قوربـــان بکـــه

بـەرکـێ مـه کـوردا بـەرکـێ جـەمـالێ
پـــێ بخـــەملینـــه بـــالای دەلالـــێ

بـەرکـێ مـه کـوردا چ عـەیـب ڤـەپوشـه[1]
ل بـــەژن و بـــالای ب زەق و خڕۆشـــه

کـه کـچ وەرگـرت گۆتـه گـو کـەمـەر
تـوق ل سـگـوێ[2] وی کـەسـره وان ل سـەر

بســـکا ل وێلـــەدت بـــەردت ســـەر پۆیـــا
تـــو فـــەرق نـــاکی ئـــەو ژ حوریـــا

---

[1] (پۆش) پەیڤەکا فارسیه و ڕامانا (بەرخوەکرن) ددەت.

[2] ستوو، گەردەن.

تو دی حەساب کێ پەریا بهەهشتێ
چ جان و ڕەندە مە شیا بۆ گەشتێ

کیژۆلێ[1] کوردا هەمی خاتووینن
بەبەکێ[2] کوردی هەمی شرینن

پێشی چەن[3] سالێ ب شەرم و حەیابین
ژ بوونا لاوا ب دەرد و دەوا بین

بەلێ ب داخەڤە عادەت مان بەردا
ب بەرکێ مەودە[4] مە شیان ل جەردا

هەر ملەتەکێ کەلەپور هەیە
بەلێ مە کوردا گەلەك زۆر هەیە

خوزیا ئەم مابان ل سەر کەلەپوورێ
ژ ڕێ و ڕەوشتا سندی نە دوورێ

---

[1] (کیژۆلە) ژ زاراڤێ سوڕانی هاتیە وەرگرتن و ڕامانا (کچ) ددەت.

[2] زارۆك، بچویك.

[3] چەند.

[4] ئەڤینی.

## دارا مرادێ

ئەگەر دارا مرادا من
نەدت هیچ بەرهەمەك تازە
من چ ژێیە كو باغێ عالەمی
پێكڤە هەمی بەرهەم

ئەگەر یارا دەلال بۆ من
كەرەم كت بۆ من بدەت ماچێ
تە چی ژێیە ئەگەر هنگڤینۆ
شەربەت ل من بن هەردەم

ئەوی چاخێ سەرێ من بێ
گولاڤ و قوت ببینن خەلك
م[1] چێ ژێیە كو تاجا خوسرەوەی[2]
زەرگەش ل سەر مام حەم

حەسوید و نەحسن دزانن دل
بەرێ دامن شەڕابەك خۆشی
تەچی ژێیە ئەگەر دونیا
وەكێ جەنەت بێ ئەو هەردەم

ئەگەر ئەز هەرغولامۆ

---

(١) من.

(٢) شاه.

بـــەنـــدەبـــم دائـــیم ل خدمـــەت دا
م[1] چـــــی ژێیـــــە كــــو زرچــــوو
حـــاكم و دلخـــۆش و هـــەم بـــێ غـــەم

ئـــەیـــاد دوژمـــن كـــەبـــەخـــتم هـــاتو
بـــــووم هـــــەردەم ببـــــت یـــــارم
تـــە چـــی ژێیـــە كـــو بـــەتبـــەختیـــێ
ژبـــــۆ تـــــە نینـــــە یـــــەك دەرهـــــەم

ئـــەگـــەر ئـــەز جـــارەكـــێ د گـــەل[2]
یـــارێ ڕویـــنم دلخـــۆش و دلگـــەش
م[3] چ ژێیـــــە بلـــــەیـــــزن هـــــەر
ب زێـــــر و گـــــەوهـــــەرا عالـــــەم

ئـــەیـــا حـــارپ ئـــەگـــەر شاهـــزاد
كـــەرەم كـــت بـــۆ مـــن یـــەك جـــارێ
چییـــــە بـــــۆ مـــــن چ تـــــا قـــــو
ڤـــە پـــڕ یـــن زێـــڕێ خـــالص تـــەم

چ طـــەیـــڕێ دەولـــەتـــێ دانـــت
ل ســـــەر شـــــان و ســـــەرێ ســـــندی
چییـــە تـــە دوژمنـــێ جـــل كـــن
هـــــزار خـــــوەلیســـــەر هـــــەردەم

---

(1) من.

(2) ل جهەكێ دیتر: ت گەل.

(3) من.

## شاهنشاه

ئاور عیقابا[1] ل سەر چیا
بەستم ئەوێ ب زۆلفێ[2] سیا[3]
دونیا ل من هەر طاریە
خستیمە وێ داڤ و عەذاب[4]

وێ خستیمە داد و مەدەد[5]
تێر ئاورێ رشتن دوو صەد
مێلاك و دل بوون قەد ب قەد[6]
لەش تێکدا پێکڤە[7] بۆ کەباب

هێڤی و مەهدەر من هەنە
ڕەحم و کەرەم کارێ تەنە
ئەم هەر د فەرمان بەندەنە[8]
حاصل[9] کت و خێر و ثەواب[1]

---

(١) سزا.

(٢) بسك.

(٣) (سیا) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (ڕەش) ددەت.

(٤) ئەشکەنجە.

(٥) گازی و هەوار.

(٦) پرت پرت.

(٧) ل جهەکێ دیتر: لەش پێکڤە تێکدا.

(٨) عەبد.

(٩) دەستڤە بینیت.

تـــو مـــــن ببـــه بوڕجـــا بـــەلــــەك
بـــەر ســـــيبەرا بســـــكين خـــەلـــەك
دێ مـــــن[2] ڤـــەژنيـــت ڤـــه فـــەلـــەك
گـەر مـەيـزەكـم[3] چـاڤێن غـوڕاب[4]

بڤــــێ جـــورێ مــــن نامــــه هنــــار[5]
بــــۆ دەســــتى شاهـــێ شـــەهســــوار[6]
مــــام ئـــــەز دحــــالێ ئينتيڤــــار[7]
دابـــۆ مـــه ڕێكــت[8] ئـــەو جـــەواب[9]

چـــاخێ د نـــــامێ فــــەكـــــرى[10]
خوانــــد ئـــــەو ب ليڤـــێ شـــەكـــرى
ڕوونشــــــت[11] بــــۆ حــــالێ مــــن گـــرى
وەختـــێ گـــەهـــا[12] دەســـتى كيتـــاب

---

[1] خێرێ.

[2] ل جهەكێ ديتر: وێ من.

[3] سەحكرن.

[4] قلەڕەش.

[5] هنارت، ل جهەكێ ديتر: هەنار.

[6] ل جهەكێ ديتر: شەسوار.

[7] ل جهەكێ ديتر: ئينتيزار.

[8] ڤرێكەت، هنێريت.

[9] بەرسڤ.

[10] سەحكرێ.

[11] ل جهەكێ ديتر: ڕوينشت.

[12] گەهشتيێ.

وەختێ ڤـــەخانـــدی ئـــەو گلـــی
یـــا صـــۆر کـــری ب خۆینـــا دلـــی
گـــو[1] کـــا فـــەقیـــرێ بـــەهـــدلی[2]
دەســـــتووره دابـــت بـــی حیجـــاب[3]

حیجـــــاب و پـــــەردە ڕاکـــــرن
زۆلفـــــێ ســـــیا[4] دبنـــــدا دورن
ئـــــەبـــرۆ ژ ماهـــــێ تـــــەڕتـــرن
خورشـــید[5] ئـــەنـــی ڕەنـــگ ئافیتـــاب[6]

خورشـــــیده یـــــانی جانـــــە ئـــــەڤ
ئـــــەڵماســـــە یـــــا دوور دانـــــە دەڤ
مـــــن گۆتـــــە کـــــارێ وانـــــە ئـــــەڤ
لـــەوڕا پـــەری تـــێن بـــێ نیقـــاب[7]

مـــــن دی پـــــەری ڕەعنـــــا[8] دلا
گاگـــا گـــولی کـــەتنـــە مـــلا
مـــــن گۆتـــــە وان دێـــــم صـــــۆرگولا
طرِســـــم[1] برێـــــژینن عـــــەذاب[2]

---

(١) گۆت.

(٢) بێ چاره.

(٣) دەرسووك.

(٤) (سیا) پەیڤەکا فارسیه و ڕامانا (ڕەش) ددەت.

(٥) (خورشید) پەیڤەکا فارسیه و ڕامانا (ڕۆژ) ددەت.

(٦) (ئافیتاب) پەیڤەکا فارسیه و ڕامانا (تاف، حەتاف) ددەت.

(٧) بێ خێلی.

(٨) جوان و خوشکوك.

مـــن گۆتـــە وی شـــیرین لـــەبـــێ[٣]
بورقـــا[٤] ڤـــەدەت ژ ئـــەنیـــا تـــە بـــێ
ئامـــــانج ل مێلاکـــــا مـــــە بـــــێ
بــەختــێ مــە ڕەش کــت وەك غــوڕاب[٥]

بـــەختـــێ تـــەمـــە دل هـــۆر نـــەکـــە
مـــە ژ ڤـــێ خیـــالێ دوور نـــەکـــە
ســـندی تـــو پـــێ رەنجـــور[٦] نـــەکـــە
شاهنشاهـــــ[٧] عـــالی[٨] جـــەنـــاب

---

(١) ل جهەکێ دیتر: تڕسم.

(٢) ئەشکەنجە.

(٣) (لەب) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (لێڤ) ددەت.

(٤) تەیسیت، جەیسیت.

(٥) قلەڕەش.

(٦) (رەنج) پەیڤەکا فارسیە و ڕامانا (واستان، تەعب) ددەت.

(٧) ل جهەکێ دیتر: ئەی کەشوەرا.

(٨) بلند، بەرێز.

## هەمەڕەنگ

هاته گوهێ من دەنگەك     ژ پارێزگاها دهوكێ
گوجێبی موهر جانەك     چ پیس و نەخۆشكوكێ

موهر جانا شاعیرا     كە دەستێ كەڕ و كورا
حەیفا ڕەوشەنبیرا     كو ببت گوڤا طڕا

ئەی ...............انی[١]     ب خودێ تو زۆر نەزانی
تو گاڤێ زێدە دڕانی     تو گەلەك بێ وجدانی

تە تف كرە شۆڕەشە     ل ناڤ بێ عەڤل و هشە
نێ گۆتنا تە غشە     ........انی[٢] كشە كشە

هندی شۆڕەشێ ڕابین     ب دەستێ شێخ و مەلا بین
ئەو ب واجبی ڕابین     كورد هەمی ب وان شا بین

ئیلا مەگەر كەر نەبت     بێ عەقلەك وەكی تە بت
یانی ئەزمان زێدە بت     یان چو مێژوو ل نك نەبت

عوبەیدوڵلاهێ شەمزینانی[٣]     و شێخ سەعیدێ پیرانی[٤]

---

(١) ناڤ هاتیە پاراستن.

(٢) ناڤ هاتیە پاراستن.

(٣) شێخ عوبەیدوللاهێ نەهری ل سالا (١٨٨٠)ێ سەرهلدان كر و ل داویێ هاتە تێكشاندن و دویركرن بۆ حیجازێ و ل سالا (١٨٨٣) مالئاڤایی كر.

(٤) شێخ سەعید پیران ل سالا (١٩٢٥)ێ دژی حكوومەتا توركیا شۆڕەشكر، ل هەمان ساڵ هاتنە سێدارەدان.

و شێخ سەلامێ بارزانی[1] و حەفیدێ سولەیمانی[2]

ئەڤە هەر چار سەرۆك بین ل شۆڕەشی نیشتمانی
کا هزرا خو باش بکە گەلۆ تو ئەڤێ دزانی

نێ ژ هەمیا زێدەتر نەمر سەرۆك بارزانی
تە تف کر شۆڕەشا وان یا ....................انی[3]

ئەو هەڤالا چ دڤێت نە وە شەرمە و نە فهێت
ئاڤا رۆی خووە دێت شەرم و حەیا وە کانێ

وە دڤێت کورد ببن کافر ل عەرەقێ بکن ڤڕ ڤڕ
ل سەرخۆشا ببت گڕگڕ دی شۆڕەشی هو چت بانی

ب کوفری و بێ ئەخلاقی یان ب زنا و دزێ
دزانم تو شیوعیێ[4] تو هۆ شۆڕشێ دزانێ

سەرکێش هەمی کافر بن مەسئوول هەمی فاجر[5] بن
ئەحزاب[6] ژی زوری بڕین دێ کوردا بن عەزمانی[7]

تو قوجا ل بەرانە دە خۆشی بێ عەقلیێ ڤەدە

---

(١) شێخ عەبدولسەلام بارزانی، دناڤبەرا سالێن (١٩٠٧-١٩٠٨)ێ دژی دەولەتا عوسمانی شۆرەشکر، ل سالا (١٩١٤)ێ ل مویسل هاتە سێدارەدان.

(٢) شێخ مەحموودێ بەرزنجی (مەلك)، پشتی چەندین سالێن تێکۆشانێ، ل سالا (١٩٥٦)ێ مالئاڤایی کر

(٣) ناڤ هاتیە پاراستن.

(٤) کومونیست.

(٥) سەرداچووی.

(٦) گەلەك (حزب) یان (پارت).

(٧) زمان.

قۆجان دگەل کەڤری    دسەرێ خۆ لێ دانێ

سندی ل هەمی چاخا    بۆ کوردینیێ بزاخا

دی تە ئێخت ناڤ داخا    ئەگەر تازە نە ڕوینی

## تویتن

ئـــــەی كـــــوردێ زۆزان و چیـــــا
تـــــویتنێ بچیـــــنن ل كێرِیـــــا
دا هـــــوین ببیـــــنن خۆشـــــیا
هـــوین تـــەرك نـــەكـــن ڤـــێ لـــەذەتـــێ

كوچكـا كـو تـویتن تـێ هـەبـت
دگـــەل وێ شـــۆرِبە قـــەوە بـــت
شـــەوقـــا دلا دێ زێـــدە بـــت
ئۆلـــداش[1] و خـــەلقـــێ صـــوحبەتـــێ

صـــوحبەت ب وێ كامـــل بـــتن
باســـكێ قـــەلـــوونێ گـــول بـــتن
خـــۆ صـــوفیا جاهـــل بـــتن
ئینكـــار نـــەكـــن ڤـــێ نیعمـــەتـــێ

ئینكـــار نـــەكـــن ڤـــێ كـــەوثـــەرێ
طـــام شـــەربـــەتـــێ بـــێهن عنبـــەرێ
تـــەشـــبیهێ[2] مســـكێ ئـــەزفـــەرێ
شـــرین ناكـــت جـــەماعـــەتـــێ

---

(1)

(2) مینا، وەكی.

شەرعێ شەریف حەرام نەکر
ئەڤ لەذەتا وەکی شەکر
پەیغەمبەری حەرام نەکر
نە د حەدیث و نە د ئایەتێ

تویتنا ل بەر ئاڤا سەرا
ل زۆزان و کیری و دەڤەرا
دائیم بکێشن ل سەفەرا
دێ زەوق و خۆشییێ دەتێ

لەذەت ئەوە تو ب تنێ
ل ڕاڤا چیائی ل ڤێ دنێ
هەر تو بکێشە تویتنێ
ژ دەست خۆ نەکە ڤێ فورصەتێ[1]

گوهە نەدە دختوری چەپەل
پەندێ وی سستی و مەلەل
قەضا و قەدەر نابت بەدەل
بزانە کو مەکتوبە[2] ئەجەل[3]

---

[1] دەلیڤە، دەرفەت.

[2] نڤیسیە.

[3] مرن.

## سلاڤ ل سەر وە

ئـــەمـــێ دەســـتپێكین ب نـــاڤێ یـــەزدانـــی
ســـــلاڤەك تـــــازە ل ســــــەر كوردســــــتانێ

ل ســەر وە هــەمیــان ئــەی گــەلــی كــوردا
ل ســـــەر مێهڤـــــان و ئـــــەڤـــــێ دانــــانێ

سـلاڤ ل سـەر وە ڕۆلـەی خـاكێ كـوردی
نهـۆ هـــوون[1] گوهبـــدن بـــۆ گۆتنـــا مـــن

سلاڤا پێنجـی و یـەك صـالا ل سـەر وە[2]
عـەزیـزن هـوون[3] برانـە[4] وەی كـوڕێن مـن

ئـــەز بـــۆ وە ڤـــێ شـــێعرێ بخـــوینم[5]
ژ دیوانــــــا خـــــۆ دا شـــــێعرێ ببیـــــنن

ســپاس بـــۆ وە هـــەمیـــان ئـــەی برانـــو
خـــودێ كــم هــوین چــو ئــازارا نــە بیــنن

هـــزار ڕەحمـــەت ل گـــوڕا بـــابێ كـــوردا[6]
ژبـــوی ئـــەم دێ پـــەســـنا هـــەر ڤـــەهـــوینن

---

[1] ل جهەكێ دیتر: هوین.

[2] ل جهەكێ دیتر: سلاڤێن جێژنا یوبیلێ ل سەر وە؛ سلاڤا پێنجی و یەك سالا ل سەر وە.

[3] ل جهەكێ دیتر: هوین.

[4] ل جهەكێ دیتر: برایان.

[5] ل جهەكێ دیتر: ئەزێ بۆ وە ئەڤێ هۆزانێ خوینم.

[6] مەلا مستەفا بارزانی.

ژبـــۆ مـــه وى بنـــاغێ كـــوردى دانـــا
ژبـەر هنـدێ هـەمـى كـورد وى دحـەبيـنن
بژيــت مــەســعوود ل ســەر ڕێبـــازا بـــابێ
ژبـــل وى دێ مـــه كـــورد ڕێ چـــو نيـــنن
هـــزار ڕەحمـــەت گـــوڕا جانـــه مـــەرگـــى
كـــو ئدريســـه خـــەمـــا وى دێ هلينـــين
ئـــەم وەفـــادار بـــن بـــۆ ڤـــێ ڕێبـــازێ
هـــەر ژ ئـــەوەلـــى و هـــەتـــا بمينـــين[1]

---

[1] من.

## شاعێرێت کوردا[1]

ل مـــــەیـــــدانێ شـــــها زەردێ بـــــەزیـــــنم
ب دەســـتێ خـــەنجـــەر و گـــوڕا د وەشـــینم
دەمـــا جـــەنگـــێ ل مـــەیـــدانی[2] چ دبیـــنم
ل نـــەیـــارێ جـــەرگ و مێلاکـــا د دڕیـــنم

چ نالبـــەنـــد[3] و چ جـــافی[4] و چ خـــانی[5]
ئـــەوان بـــەیـــڕەق[6] د شـــێعرێ بریـــە بـــانی

جەگەرخوین[7] و ڕاجی و فەقەهێ طەیران[8]
د هۆزانـــا عالـــەم وا بریـــە عـــەزمـــان[9]

مـــەلا مـــەنصـــۆرێ گرگاشـــی[1] و باتـــەی[2]

---

[1] هەلبەستڤان دبێژیت: "ئەی ئامادەیێن خۆشەویست و بەرێز، مللەتێ کورد گەلەك ناوبوێژ و هۆزانڤان د هەمی چەرخاندا هەبینە، بەلکێ پێش بینا عیسای (س) ب (١٨٠٠) صالا هەر وەکی د مێژوویێدا هاتیە زانین، گوهـ بدنێ ئەڤە هۆزانڤانەکێ کورد پێش بینا عیسایی (م) ب (٤٩٠) صالا پەسنێ خۆ ددەت و دبێژت"

[2] ل جهەکی دیتر: ل کورێ ئەز.

[3] ئەحمەدێ نالبەند (١٨٩٠-١٩٦٣).

[4] ئێل بەگی جاف (١٤٩٢-١٥٥٣).

[5] ئەحمەدێ خانی (١٦٥٠-١٧٠٧).

[6] ئالێ.

[7] جەگەرخوین (١٩٠٣-١٩٨٤).

[8] فەقیێ تەیران (١٥٩٠-١٦٦٠).

[9] ئەزمان، زمان.

ئەدەب وا كر ژبۆ كوردا گەلەك هەی

هەژار[3] و شێخ ڕضا[4] ئەو هاتنە هاری
گەلەك دیتر وەكی پەرتووێ هەكاری

بەكر بەگ[5] و بەدرخان[6] هەر دوو جندی[7]
یەك ژ وان دوستكی و ئێ دییە سندی

د هۆزانا دوڕا ئەو هەر درێژن
ب ڕاستی هەر دوو زانا و ب وێژن

پەریشانێ ل ڕێیی و حاجی قادر[8]
ژ دەڤێ وان هەر دڕشتن گەوهەر و دڕ

عەلی تەرموكی[9] و بابا[10] و حەریری[11]
سەرێ هەمیانە سەیدائێ جزیری[12]

---

(1) ژدایكبوون و وەغەركرنا نەیا دیارە لێ ل گەل مەلایێ باتەی هەڤچەرخ بوو (١٤١٧-١٤٩٥).

(2) مەلا حسێنێ باتەی (١٤١٧-١٤٩١).

(3) هەژار موكریانی (١٩٢١-١٩٩١).

(4) شێخ ڕزا تاڵبانی (١٨٣١-١٩١٠).

(5) بەكر بەگێ ئەرزی (١٧٤٠-١٨٤٠).

(6) بەدرخان عەبدوللا بەدری سندی (١٩٤٣-...).

(7) باش، قەنج.

(8) حاجی قادر كویی (١٨١٧-١٨٩٧).

(9) عەلی تەرموكی د سەدێ یازدێ زایینی دابوو.

(10) بابا تاهڕ یان بابا تاهڕ عوریان د سەدێ یازدێ زایینی دابوو.

(11) عەلی حەریری (١٤٢٥-١٤٩٥).

(12) مەلا ئەحمەدێ جزیری ناڤدار ب مەلایێ جزیری (١٥٧٠-١٦٤٠).

ســـەرێ هنـــدی ئـــەڤینـــدارا ئـــەحمـــەد[1]
ئـــەوی ئـــالا و تـــوخ ڕاکرنـــە بـــێ حـــەد

ب ڕاســـتی ئـــەو ســـەرێ هنـــدێ ب وێـــژە
د شـــێعرا خـــۆ ب خـــۆ ئـــەو ڤـــێ دبێـــژە[2]

تـــو فـــەکـــرە عـــاجزی[1] و شـــیخ بالیســـانی[2]

---

[1] ئەحمەدێ خانی.

[2]

د عشـــــقێ شـــــێخێ پانیمــــــە
بـــــەدل نـــــەحوا مەعانیمــــــە
لـــــذی حجـــــر و فـــــی قلـــــب
شـــــفاء فـــــــی اشـــــــاراتی
د تـــــەعلیمێ ســـــوخەن میـــــرم
د شـــــعرێدا جهـــــان گیـــــرم
ویعلـــــم موکـــــب العشـــــاق
اعلامـــــــــــی و رایـــــــــــاتی

جزیزی کوردەکێ نیشتیمانپەروەر و حەز وەلاتێ خوە دکر د هۆزانێن خوەدا دبێژت:

ئـــەڤ نـــارڕ و ســـیقالا دلـــە
دائـــیم ل وی قـــالا لادلـــە
نـــەورۆز وســـەر ســـالا دلـــە
وەقتـــێ کـــو هلبـــت ئـــەو ســـیراج
حـــــەتا ب نـــــۆرا بـــــادەئێ
ڕەنگـــین نـــەکین ســـجادەئێ
دوریـــــن ژ وی شـــــەهزادەئێ
دۆڕ دانـــە یـــا گـــەردەن ژ عـــاج
((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ هاتیە وەرگرتن))

ل دینــــی کـــو ئـــەدەب وان بریـــە بـــانی

دنـــالم ئـــەز ژبـــۆ نـــالیی[3] و ســـالم[4]
دگـــەل وان مـــەولـــەویـــی[5] کـــویی[6] عـــالم

د فـــەکـــرن بـــەرهـــەمـــێ نـــاری و[7] زێـــوەر[8]
بـــەلاڤبوویـــە ل نـــاڤ صـــۆران[9] ســـەران ســـەر

چ مـــەجـــدی[10] و پیـــرەمێـــر[11] و بێســـەرانـــی[12]
هنرمـــەنـــدی د شـــیعرێ بریـــە بـــانی

دگـــەل وان ســـالمی وبێکـــەس[13] و موختـــار[14]
بـــــوێژن ئـــــەو د شــــیعرێ زۆری دژوار

وەلـــی دێوانـــە ئـــۆ قـــانع[1] و گـــوڕان[2]

---

(1) حاجی مەلا سەید عەبدوڵلا سەید موحەممەد حوسەینی بەرزنجی ناڤدار ب عاجری (١٩٢٩-١٩٦٧).

(2) شێخ موحەممەد تەها بالیسانی(١٩١٧-١٩٩٥).

(3) مەلا خدر شاویسی میکایلی ناڤدار ب نالی (١٧٩٥-١٨٥٥).

(4) عەبدولڕەحمان بەگ صاحبقەڕان ناڤدار ب سالم (١٨٠٠-١٨٦٦).

(5) عەبدولڕەحیم مەلا سەعید ناڤدار ب مەولەوی (١٨٠٦-١٨٨٢).

(6) حاجی قادرێ کویی.

(7) مەلا کاکە حەمە بیلویی ناڤدار ب ناری (١٨٧٤-١٩٤٤).

(8) مەلا عەبدوڵلا کوڕێ موحەممەد ئەفەندی ناڤدار ب زیوەر (١٨٧٥-١٩٨٤).

(9) سوڕان.

(10) عەبدولمەجید مەلیکولکەلامێ کوردستانی ناڤدار ب مەجدی (١٨٥١-١٩٢٧).

(11) تەوفیق مەحموود هەمزە ناڤدار ب پیرەمێرد (١٨٦٧-١٩٥٠).

(12) بیسەران (١٦٤٣-١٧٠١).

(13) فایق عەبدوڵلا ناڤدار ب بێکەس (١٩٠٥-١٩٤٨).

(14) ئەحمەد موختار بەگی جاف (١٨٩٨-١٩٣٥).

ژبــۆ مــە چانــد ئــەوان بــەخچــەی گولســتان

حوســەیــن حزنــی[3] و ڕەفیــق حلمــی[4] چ ڕەنــدن
د شـــیعرێدا یـــەقـــین ئـــەو پـــا بلنـــدن

ئـــەمـــین زەکـــی بـــەگ[5] و صـــالح قـــەتـــاری
ئـــەوان بـــەرهـــەم ژبـــۆ مـــە کـــر دیـــاری

عـــەلائـــوددین[6] و هـــێمن[7] پاشـــی گـــۆران
چ ڕەوشـــەنبیـــر و زانانـــە ل صـــۆران[8]

ســەلام و کامــەران[9] و ئــەحمــەد مختــار[10]
ژبـــۆ مـــە ڤـــەدهـــوینن دۆڕێ گـــولزار

دە فـــەکـــرن طـــاهرێ شۆشـــیێ[11] نـــازدار
ژبـــۆ مـــە وی ڤـــەهوینـــا دۆرێ گـــولزار

تــە ڕوح خــۆش بــت ئــەیــا طــاهرێ شۆشــی
ســەبــەب گــولزاری کــەوثــەر ڤــەدنۆشــی[1]

---

[1] موحەممەد کابۆلی ناڤدار ب قانع (١٨٩٨-١٩٦٥).

[2] عەبدوڵلا ناڤدار ب گوران (١٩٠٤-١٩٦٢).

[3] حوسێن حوزنی عەبدوڵڵەتیف موکریانی (١٨٩٣-١٩٤٧).

[4] ڕەفیق حلمی (١٨٩٨-١٩٦٠).

[5] موحەممەد ئەمین زەکی (١٨٨٠-١٩٥٨).

[6] عەلائەددین سوجادی (١٩٠٧-١٩٨٤).

[7] سەید موحەممەد ئەمین شێخولئیسلامێ موکری ناڤدار ب هێمن (١٩٢١-١٩٨٦).

[8] سوڕان.

[9] موحەممەد ئەحمەد تەها ناڤدار ب کامەڕان موکری (١٩٢٩-١٩٨٦).

[10] ئەحمەد موختار بەگێ جاف (١٨٩٨-١٩٣٥).

[11] شێخ تاهرِ کوڕێ مەلا موحەممەد شۆشی (١٩١٧-١٩٦٢).

سـپاس هـــەر ژبـــۆ زانـــائێ ســـندی
گـورێ صـاحب شـەرانشـی[٢] دەسـت بلـندی

محمـد خـــۆڕکیێ[٣] کـو ئـە مزیـــری[٤]
چ زانـا بـی ل هــەمــی عیلمـا نـە دویـری

دە فـــەکـــرن طـــاهرێ ڕۆشــدی ئـــەلعمـــادی
ب مـــەجنـــون[٥] و ئـــەبـــۆ نـــەواســـا[٦] نـــادی

چ حـــاجی قـــادرێ کـــوفلی و مـــائی
ژبـــۆ وان ئـــەدخـــوینن هـــەر دمـــائی

ل پـێش ڤانـە ئـەوێـن هـەر دوو ب هیمـەت
ئـــەوێـــن زانـــا ژبـــۆ کـــوردا ب دڕایـــەت

---

(١) پشتی ئەڤان مە هەلبەستڤانێ خودان شیان شەمسەددین قوتب باپیرێ مالباتا بریفکانیان ئەوێ کو سالێن (٩٩٧ک-١١٨٥)ێ ژیایە، پشتی وی نەڤیێ وی شێخێ بهاگران نۆرەددینێ بریفکانی، پاشان هەلبەستڤان موحەممەد تەیار پاشا ئەوێ کو پشتی سالا (١٢١٣ز) ژیایە و دیوانا مەلا جزیری ب خەتێ خوە جوان نقیسی، پشتی ئەڤان حەسەن بامەڕنی، حاجی قادر کوڤلی و مائی، و د ئەڤی چەرخیدا هندەك هەلبەستڤان پەیدا بوون کو بەرهەمێن ئەدەبی پشت خوە هێلاینە ژ ئەوان: ئەحمەدێ نالبەند زانایێ ناڤدار شێخ مەمدوح بریفکانی و تاهر ڕوشدی ئامێدی، هەر ل گەل ئەڤان هژمارەکا زێدە یا زانایێن ئایینی پەیدا بووینە وەك: ئیبن حاجبێ سندیێ شەرانشی، حەسەن کۆڕێ نوحیێ قومریێ بەرواری، شێخ موحەممەد خرکی و چەندین زانایێن دیتر. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(٢) موحەممەد کورێ عەلیێ شەرانشی د سەدێ هەڤدێ دابوو.

(٣) موحەممەد خورکی موزیری ل سالا (١٦٥٠ز) وەغەر کریە.

(٤) ئەو مزیری.

(٥) هەلبەستڤانێ عەرەب قەیس کورێ مەلوحی ناڤدار ب مەجنون لەیلا (٦٤٥-٦٨٨).

(٦) هەلبەستڤانێ عەرەب ئەلحەسەن کورێ هانی حەکەمی ناڤدار ب ئەبو نەواس (٧٥٨-٨١٤).

چ شەمسەددین[١] و نۆڕەدین[٢] دەلان
ژبۆ رێچا مە کوردا هەر هەڤالن

ئەوان ساخلەم کرن ئەو مافێ دائێ
کو شەمسەددین وەکی نۆڕ و چرائێ

بڕێژە یا خودا ڕەحمەت ژ بانی
ل ئەڤیندار هەموو یان خاسمە خانی

ئەز ل ڕێچا ئەڤانە د لەزینم
کو سندی مە دورا ئەز ڤەهوینم

ئە شاگردم ژبۆ ڤانە ب دەوامی
سپاسدارم ژبۆ هەمیا ب تەمامی[٣]

---

[١] زانا و هەلبەستڤان شێخ شەمسەددین قوتبێ بریفکانی ئەخلاتی (١٥٨٨-١٦٧٤).

[٢] زانا و هەلبەستڤان شێخ نوڕەددینێ شێخ عەبدولجەببار بریفکانی (١٧٩٠-١٨٥١).

[٣] گەلەك هەلبەستڤانێن دیتر ژ کوردان یێن هەین، لێ ب تنی ئەز ئاگەهداری ئەڤان چەند کەسان بووم، لەورا داخوازێ ژ تورەڤانان دکەم ب شێوەیەکی باشتر ژ من بنڤیسن. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

# دەڤێ ئێکێ[1]

ئـــارێ ئـــەول میـــرێ خـــەلـــدیا
دائـیم وی شـەڕ بـی دگـەل ئاشـووریا

هـەر ب ڤـی نـاڤی ئـەوە سـەر دفتـەر
میـرێ کـوردا بـی چـاخێ شـەلمنصـەر

نـــاڤێ تـــە خۆشـــە ئـــارێ دەلال
نـــێ ئـــەم ئارینـــە ژ وێ ڕهـــا زەلال

هەشت صەد و چل و نەهـ صالێ[2] بەری
بینـــا عیســـای ئـــاری میـــر ســـەری

---

[1] شاهـ (ئاری) یێ ئێکێ (خالدی)کو ل گەل شاهێ ئاشووری (شلمنسەر)ێ سێیێ هەڤدەم بوو، لێ ژبەر ژیێ وی یێ مەزن و نەشیانێن وی د ڕێڤەبرنا وەلاتی دا کوڕێ وی (ساردەریس)ی ب کاروبارێن وەڵاتی ڕابوو. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[2] ساڵا.

## دەقێ دوویێ[1]

ملـــك ئســـــپونيس كـــورێ ئاريـــا
زمـــانێ كـــوردى وى گـــەلـــەك ڤيـــا

پێشـــى وى خوانـــدن ب ئاشـــوورى بـــوو
زمـــانێ دايـــێ نـــە ئـــێ ڕەســـمى[2] بـــوو

وى كـــر ب ڕەســـمى زمـــانێ دائـــێ
ل نـــاڤ دەولـــەتـــا ئۆراڕتووائـــێ

هاتـــە نڤيســـين ل ســـەر فـــەرشـــێ بـــەرە
دگـــەل ئاشـــووريا هـــەڕ و هـــەر شـــەڕە

[1] شاهـ (ئيسپونيس) ئان (ئيبونيس) كو ناڤێ وى شاهـ(ساردوريس) كوڕێ شاهـ (ئارى)يێ ئێكێ يە كو ئەوى زمانێ (خالدى) ل شوينا زمانى (ئاشوورى) كو زمانێ خواندن و نڤيسينێ يێ وى سەردەمى بوو دانا. وەلاتێ وى ب (ئۆراڕتوو) ژبەر چيايێ (ئاراڕات) دهێتە نياسين، ئەو شوينوارێن ل (كێلەشين) سەر ب دەڤەرا (ڕايات) هاتينە ڤەديتن، ژ ڤەكرنێن (ئيسپونيس)ێ ناڤبرى ل سەر بەران ب زمانێ ئاشوورى هاتيە نڤيسين پێكهاتيە. ((ژ تيبينيێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ ديوانێ ب زمانێ عەرەبى هاتيە وەرگێڕان)).

[2] فەرمى.

## دەڤێ سێیێ[1]

میـــر ئـــۆلام ڕابـــوو ژ کاســـانیا
پلامـــاڕ وی[2] بـــر ســـەر ســـومەڕیـــا

کوشـتە میـرێ وان کـو میـر ئیـگامیـل
مـال و منـداڵ لـێ هـەمـی کرنـە دیـل[3]

[1] شاهـ (ئۆلام) بووریاش کوڕێ شاهـ (بووڕنا بووڕایش)ێ کاسی کو شاهێ دەولەتا کوردی (عیلامی= ئیلامی) بوو. ئەڤی شاهێ قەهرەمان ل سەردەمێ شاهـ (ئیگامیل) هێرش برە ل سەر حکوومەتا سۆمەڕیان و شیا ئەوان بشکینیت و ببیتە دەستهەڵاتدارێ سۆمەڕیان. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[2] هێرش.

[3] ئێخسیر.

## دەڤێ چارێ[1]

سـێ هــەزار و صــەد[2] بــەری زایینــێ
ئانــانۆم میــر بــوو ل شاهــنەشــینێ

ل شـاخێ زغـروس[3] کـەلـهە دەینـا بـێ
ژ تیــرێ کــوردا ژ گــەتیــا[4] بــێ

---

(1) شاه (ئانانۆم) شاهەکێ کوردانە و ل چیایێ زاگرۆس ل کەلهەکا موکوم و ئاسێ دا بوو، ژ هۆزا (گرتی) یا کوردی و ل سالا (٢١٠٠ب) دابوو. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(2) سەد.

(3) زاگروس.

(4) گۆتیا.

## دەقێ پێنجێ[١]

ئاکۆمێ سێ میرێ ب هیمەت
ل سەر سومەرپیا ڕاکر قیامەت

سومەڕ و ئاکاد هەر دوو ب تەمامی
ژبۆ (ئاکۆمی)کرن غولامی

کوردێ کاسانی ئەڤ مرۆڤێ هۆ باش
ناسناڤ ژبۆ وان کر (کاردونیاش)

جهێ وی زێدەی جهێ هەمیا بی
پتر بی ژ جهێ میر حەمۆڕابی

---

[١] شاهـ (ئاکۆم)ێ سێیێ کو ژ بڕازاییێن شاهـ (ئۆلام بووڕیاش) بوو، ئەڤی شاهی دەستێ خوە ل سەر دویماهیك کەلها ئاکنجییێن کەناری ژ سۆمەڕیان دانا و پشتی ئەڤێ چەندێ ئەڤی شاهی شیا حوکمڕانیا سەرانسەری بکەت و خوە ب ناسناڤێ (کاردونیاش) دا بدەتە نیاسین کو جهێ دەستهلاتداریا ئەوی دناڤبەرا وەلاتێ سۆمەڕ و ئەکەدا بوو و حوکمڕانێن کاسی ب ئەڤی ناسناڤێ نوی بوون، دەستهلاتداریا ئەوان بەر ب دەڤەرێن دیتر بەرفرەهـ بوو و هەتا گەهشتە ئەوان دەڤەرێن شاهـ (حەمۆڕابی) یێ ناڤدار حوکمرانی لێ دکر، ل گەل (حیثیان) کەڤتنە شەڕی دا و شیا ئەوان بشکێنیت و تەڤایا ئەوان پەیکەر و کەلوپەلێن (حیثیان) تالانکرین بزڤڕینیت. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

## دەڤێ شەشێ[1]

پێــنج صــەد و پێنجــی بــەری عیســای
میــر ئیختویکـــوو مـــیرێ مـیدیـــای

چوویـه شـەرێ وی کوروشـێ ئـەخمینـی[2]
میـــدی پـــۆیچکرن ئـــەوی لـــەعینـــی

[1] شاهـ (ئستیاغ ئیختویگو) کو ئێك ژ پادشاهـێن کوردێن (میدی) بوو، کو ل گەل شاهـ (کوروش- کەیخسروێ مەزن) شاهـی ئەخمینی (هەخامەنشی) هەڤچەرخ بوو، ل سالا (٥٥٠ب) شاهـێ ئەخمینی یێ ناڤبری شیا دەستهلاتداریا (میدی) ل سەردەمێ (ئستیاغ ئیختویگو)ی ژناڤببەت و داوی ب دەستهلاتداریا (میدی) بهینیت. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[2] هەخامەنشی.

## دەڤێ حەفتێ[1]

ئـــەی ئـــەردەوانـــو میـــرێ میـــدیا
تـــە دەســـت ڕاکیشـــا ســـەر ئـــەرمـــەنیـــا

میـــرێ ئـــەرمـــەنـــی دومـــانێ ئـــەوەل
زانـــی کـــورد شـــێرن لـــەو بوونـــە عاقـــل

ژ بـــێ چـــارەیـــی بـــۆ تـــە بـــوون غـــولام
ئـەرمـەنـی هـەمـی پێکڤـە خـاص و عـام[2]

---

(1) شاهـ (ئەردەوان)ێ سێیێ، بو ئێکەمین جار حوکمڕانی ل دەڤەرێن (میدیا) بچویك دکر، ل دەستپێکا کارێ وی ل سالا (١٦ز) جەنگەك دناڤبەرا وی و شاهـ (دومان) ل سەر ئەرمینیا و کوردستانێ ڕویدا، لێ شاهـ (دومان) شکەستن هینا و نەشیا دەست ل سەر دەڤەرێن ناڤبریدا بگریت، (دومان) نەچاربوو بو دویرترین جهێ ئەرمینیا برەڤیت و خوە وەك حوکمڕان بدەتە نیاسین لێ ژبەر هێزا (ئەردەوان)ی نەشیا دەستهلاتداریێ بکەت و دەست ژ حوکمڕانیێ بەردا. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(2) تایبەتی و گشتی.

## دەڤێ هەشتێ[١]

ئـــەمیخـــا میـــرێ لولویـــا بـــی
کـــەلـــەمـــێ چـــاڤێ ئاشـــووریا بـــی

هنبـــەری وی بـــوو مـــەلـــك (شلمنصـــەر)
پێڤـــە خـــەریـــك[٢] بـــوو ئـــەوی بکـــت دەر

هنگامـــە[٣]شـــەڕ ئـــەوان دگـــەل بـــوون
ل هـەمـی هنگاما دگـەل پـەنجـەر بـوون

[١] شاهـ (ئەمینخا)یێ لولوی ئێك ژ پادشاهێن کوردێن لولوی بوو کو د سالا (٨٨٠ ب) بوو، ل گەل شاهێ ئاشووری (شلمنسەر)ی و کوڕێ وی (ئاشووربانیپال) هەڤدەم بوو، چەندین جەنگ دناڤبەرا وی و (ئەمیخای) ڕویدا، لێ ئاشووری سەرنەکەڤتن. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[٢] مژویل.

[٣] دەمێ.

## دەقێ نەهێ[1]

سـێ هــەزار و صــەد بــەری عیســای
میــر ئــەنــانومێ بــەیــرەق[2] هلــدای

نــێ ئــە[3] مــەلــك بــی ل ســەر لاغاشــە
گــەر ل میژوویــێ بكــی تــەماشــە

ئــەوەل زاغروســێ[4] ژ تیــرا گۆتیــا
بــەری هــەر كــەســی میرینــی ڤیــا

---

[1] شاهـ (ئەنتاتوم)ێ ئێكێ، ئەڤ شاهە ئێكەم شاهـ بوو ژ كوردان ژ گەلێن (زاگروس) ژ گۆتیان، د چەرخێ (٢١ب) دەستهەڵاتداری ل (لاغاش) دكر. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[2] ئالا.

[3] ئەو.

[4] زاگروس.

## دەڤێ دەهێ[1]

ئەنوبانینی میرێ قەهرەمان
وی ب مێرینی ڤەکر بە هالمان

پێشی سارغونێ[2] ئەکادی میر بوو
خودان بەیراق و تاج و وەزیر بوو

---

[1] شاه (ئەنونوبانی) ئێك ژ پادشاهێن گۆتیان بوو، ئەو بوو ئەوێ بەری (سارگون)ێ ئەکەدی حوکمڕانی ل (حەلوان)ێ دکر. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[2] سارگونێ ئەکەدی.

## دەقێ یازدێ

میرەك مە كوردا میر ئەردەشیر بی
كوڕی بابكی گەلەكێ مێر بی[1]

دەما بی حەف[2] صالْ بابی كرە خێر
ژبۆ ئاگری داكو ببت مێر

---

(1) ئەردەشیر كوڕێ بابەكی كوڕێ سامانێ بچویك كوڕێ بابەكێ ناڤین كورێ سامانێ ناڤین كوڕێ بابەكێ ئێكێ كوڕێ مهدسێ كوڕێ سامانێ ئێكێ كورێ بەهمەنێ ئێكێ كوڕێ ئەسفەندیاری كوڕێ پستاسب كوڕێ كەی لوهرسبی كوڕێ كیوخی كوڕێ كیكاووسی كورێ كەیقوبادی. پشتی مەزن بووی دخواست تۆلا شاهـ (دارا)ی كوڕێ دارای شاهێ كوردان ڤەكەت، كو جارەكا دیتر دەستهەلاتێ بو خودانێ وێ زڤڕینتەڤە، سەر وێ یا یێن بەری وی سەر ب ڕێڤە دچوون ئەوێن بەری شاهێن (ئەشكانی) كورد بوون. ب تنێ ئەوان ل ژێر فەرمانا سەرۆكەكی كۆم بكەت. هاتیە زانین كو ژدایكبوونا وی ل گوندەكی ژ گوندێن (ئیستەخرێ) بوو. وەسا دخواست وەلاتی سەر دوازدە دەڤەران دابەش بكەتن، باپیرێ وی (سامان) گەلەك حەز ژ نێچیرێ دكر، ژنەك ژ دویندەها شاهێن فارسان بو خوە هینا كو ب (بادرنحیان) ناڤدار بوون و سەرپەرشتیا مالباتا (نارهیت)ی ل ئیستەخەرێ دكر. خودێ كوڕەك ب ناڤێ (بابەك) دایێ و پشتی مەزن بووی، دویڤ بابێ خوە دا بو خودان دەستهەلات، پاشی خودێ كوڕەك ب ناڤێ (ئەردەشیر) دایێ و وی سەردەمێ (بادرنجری) مەزناتی و شاهاتی ل ئیستەخرێ دكر و دگۆتنە وی (جوزەهر)، كو ژ وی خواست (ئەردەشیر)ی ڕادەستی (تیری) بكەت داكو ببیتە ئاگرداری پەرستگەهێ. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(2) حەڤت.

وی گۆتــه تیــری بــلا ل نــك تــه بــت
چــاخێ تــو مــری دا ل شــوینا تــه بــت

تیــری ســـەرۆکـــێ ئـــاگر پـــەرێســـا
ئـــەردەشـــیری لاو تـــەشـــیا وی رێســـا[١]

جارەکـێ وی دی[٢] ل خـەونـێ یـەك مـەلـەك
گۆتــه وی رابــه ســـەرخــۆ چــاڤ بــەلــەك

تـــو شاهنشاهـــ و هـــەم جیهـــان گیـــری[٣]
خـــودان بیـــراغ[٤] و تـــاج و وەزیـــری

پشـــتی ڤـــێ خـــەونـــێ باشـــی بـــەلاڤکـــر
خەلکێ ئەصطەخرێ[٥] هەمی ل خۆ چاڤ کر

بـــەری هـــەر تشـــتی وی کوشـــت[٦] (فاســـین)
باشـی (مـەنوچـەهـر) هـەر دوو مـەلیـك بـین[١]

---

(١) دەمێ ژیێ (ئەردەشیر)ی بوویه حەفت ساڵ، بابێ وی ئەو ڕادەستی (جوزهر)ی کر و ژ وی خواست کو ڕادەستی (تیری) بکەت. داکو ببیته سەرپەرشت و پەروەردەکارێ وی و ل دەمێ مرنا (تیری) شوینا وی بگریت، (تیری) ئەڤ چەندە قەبویل کر و ل دەمێ (تیری) مری ئێکسەر(ئەردەشیر)ی ب شێوەیەکی باش جهێ وی گرت، فالڤەکەرێن ئەوان خوەیا کر کو هەبوونا وی دێ وەڵات ب هێز کەڤیت، ئەردەشیری خوە ب هیز ئێخست کو هەتا وی دەمی وەکو وی نەهاتبوون، دەستێ باشی و قەنجیێ بو دەستکورتان درێژ کر. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیه وەرگێڕان)).

(٢) دیت.

(٣) جیهان ڤەکر، دونیا ڤەگر.

(٤) بیراق، بەیراق واته (ئالا).

(٥) ئیستەخر؛ ل جهەکێ دیتر: ئسطەخرێ.

(٦) کوشته.

فـــــەرمانـــــەك هنـــــار[٢] ژ بوونـــا بـــابێ
بــــابێ وی ڕابـــــی ب وێ جــــــەوابـــــێ[٣]

وی كوشـــتە (جـــوزهر) دگـــەل (ئـــەردەوان)
هـــەر دوو مـــەلیـــك بـــین شاهـــانێ جیـــان

پاشـــی چـــو (لـــەزوێـــز) وی كوشـــتە (دارا)
ئـــەڤـــە هـــەر دوو بـــین ســـەرۆكـــێ مـــارا[٤]

بـــابێ (ئـــەردەشـــیر) مـــر چـــوو فـــەنـــایێ
كـــەســـەك نامینـــت ل ڤـــێ دونیـــایێ[٥]

---

[١] پاشی بەرەڤ (دارابجرد) چوو، د خەونا خوەدا دیت شاهەك بن سەرێ وی ڕوینشتی بوو و گۆتە وی: خودێ دێ ئەڤی وەلاتی ئێخیتە ژێر دەستێ تە ڤێجا گەلەك زێدە قەنجی و باشی كرن. پاشی بەرەڤ (خوبابان) د تەبڕی دا (جوبابان) هاتیە یانی (جوویا بابان). كو شاهێ وێرێ شاه (فاسین) كوشت. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[٢] هنارت.

[٣] بەرسڤێ.

[٤] پاشی بەرەڤ جهەكێ ب ناڤێ (لزویز) چوو و شاهێ وێرێ (مەنوچهر) كوشت، پاشی شاهەكێ دیتر بناڤێ (دارا) كوشت و هندەك ژ خەلك و كەسانێن نێزیكی خوە ل وێرێ ئاكنجی كرن، پاشی ئەو تشتا ب سەرێ وی هاتی بو بابێ خوە نڤیسی و فەرمانا وی دا بچیتە (جوزهەر)ی شاهێ فارسان كو ل (بیچاء) بوو و (جوزهەر) كوشت و تاجا وی ژی بو خوە هینا. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[٥] بۆ (ئەردەوان)ی شاهێ چیان و دەڤەرێن پێڤە گرێدای نڤیسی و هیڤی بو خوە ژێكر و ژ وی خواست كو تانجا (جوزهەر)ی دانیتە سەر سەرێ كورێ وی (سابوور)ی كو ژ ئەردەشیری مەزنتر بوو، لێ ئەڤ چەندە قەبویل نەكر و گەڤە ل وی كرن و بابێ وی د

ســـــابووریٚ بـــــرا ڤیـــــا ببـــــت میـــــر
بـــیٚ عـــەقــل و هـــۆش بـــیٚ بیـــر و تـــەدبیـــر

نێزیـــــك و خزمـــــا ژێـــــەر تـــــاج و تـــــەخـــــت
دانـــە ئـــەردەشـــیر بـــۆ وی پشـــك و بـــەخـــت[1]

چـــوو (دارا بجـــرد) [2] گـــەهایـــە کـــەرمـــان[3]
وی کوشـــتـــە بـــلاش لـــێ ڕاکـــر فـــەرمـــان

ســـەر لـــەشـــکەر و میـــر بـــۆ وی کـــوم ڤـــەبـــوون
ئـــەو چوویـــە ســـاحل وی کوشـــتـــە (ئـــســـپون)[4]

---

هەولا خوەدا سەرکەڤتی نەبوو و پشتی سێ ڕۆژان مر. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(1) تاج کرە سەرێ (سابوور)ێ کوڕێ بابەکی برایێ ئەردەشیری، ل شوینا بابێ خوە بو شاهـ، بلەز بو برایێ خوە ئەردەشیری نقیسی، لێ ئەو بۆ ڕێگر. سابوور گەلەك تێکچوو و دلگران بوو و هژمارەکا زێدە ژ لەشکەریان کومکرن و ب مەبەستا شەڕکرنێ بەرەڤ ئالیێ ویڤە چوو، ژ (ئیستەخرێ) دەرکەڤت، کو هژمارەکا زێدە ژ لەشکەریان و کەسوکار و برا و هەڤالێن وی ل گەل وی دا بوون. تانج و تەختێ دەستهەلاتێ ڕادەستی (ئەردەشیری) کرن و تانج دانا سەر سەرێ وی و ب هێز کەڤت. فەرمان بجههینا و ئەو کرە وەزیر و زانایەك (موبەزەان) دا ل گەل وی. هەست ب وی چەندێ کر کو برایێن وی و ئەوێن ل گەل وی دا دێ وی کوژن، لەوڕا ڕابوو گەلەك ژ ئەوان کوشتن. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(2) دارابگرد، ئێکەمین پایتەختا ساسانیان بوو، نوکە سەر ب پارێزگەها فارس ڤەیە ل باشوورێ ئیرانێ.

(3) کرمان، دکەڤیتە باشوورێ ڕۆژهەلاتێ ئیرانێ، نوکە ئێك ژ پارێزگەهێن ئیرانێ یە.

(4) خەلکێ (دارابجرد) دژی وی ڕابوون، ل وێرێ زڤڕی و وێرێ ستاند و خەلکێ وێ کوشتن، پاشان بەرەڤ (کرمان) چوو کو شاهەك ل وێرێ بوو دگۆتنێ (بلاش)

پاشی ڤەگەڕیا هاتە (کوردستان)
وی کوشتە (مێهرك) میرێ ئێریڤان

گەهشتە (جۆرێ) زۆری ب تەق و ڕەق
ئاڤاکر (طرپال) دبێژنێ جەوسەق

نامەك گەهشتی ژ (ئەردەوانی)
دەما وی خواندی مەعنا وێ زانی

مللەت کوگر و گەلەك ژێ چەڤاند
پاشی دەرانی و ل سەر وا ڤەخواند

تی نقیسی بی ئەی کوڕێ کوردی
جهێ وە کوینن برایێ جوردی

کێ ئیزنا تەدا ب ملك و تاجا
بسطینی[1] ژ خەلکێ خەرج و خەراجا[2]

---

شەرەکێ دژوار دناڤبەرا ئەواندا ڕویدا کو ئەردەشیری ب خوە شەڕ دکر، دەرئەنجام (بلاش) ئێخسیر کر و دەست دانا ل سەر باژێڕی. کوڕەکێ خوە کو هەروەسا دگۆتنێ (ئەردەشیر) ل وێرێ دەستنیشانکر. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(١) ل جهەکێ دیتر: بصطینێ.

(٢) هنارتیەك کو هەلگرێ نامەیەك بوو ژ دەڤ (ئەردەوان)ی شاهەنشاهێ فارسان گەهشتە دەڤ (ئەردەشیر)ی، ئەوی خەلك کومکرن و نامە بۆ ئەوان خواند کو تێدا هاتبوو: (تو شیای هێزا خوە نیشان بدەی، تە مرنا خوە نێزیك کر (ئەی کوردو) ئەوا دناڤبەرا کوینان‌دا هاتی پەروەردەکرن، کی دەستویر دابوو تو تانجێ بکەیە سەرێ خوە و دەستهەلاتدارێ ل وی وەلاتی بکەی، کێ گۆتە تە باژێڕان ئاڤا بکەی. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

شیری نقیسی بەرسڤەك بەیان
هنارەڤە[١] وی بوونا[٢] ئەردەوان

گۆتێ ڤیام ئەز یەزدانێ مەزن
تەخت و تاج و هێز ئەوی دانە من

مهێڤی[٣] هەیە ژ وی یەزدانی
سەرێ تە بچت ناڤ ئاگردانی

پاشی چەن[٤] ڕۆژا وی کوشت (نیروفەر)
دناڤ هنگامی[٥] ب دەست و خەنجەر

نامە هنار[٦] بۆ میرێ ئەهوازی
بێژە کالکو شەڕی دخوازی

جەواب[٧] ڤەدا ڤە مەلیك ئەدەوان
ئەم دێ[٨] لێك بدین ل لایێ[٩] هورمزجان[١٠]

---

[١] هنارتە ڤە.

[٢] ژبۆ، بۆ.

[٣] من هیڤی.

[٤] چەند.

[٥] دەمێ.

[٦] هنارت.

[٧] بەرسڤ.

[٨] ل جهەکێ دیتر: دێ ئەم.

[٩] هورمزگان، دکەڤیتە باشوورێ ئیرانێ، نوکە ئێك ژ پارێزگەهێن ئیرانێ یە.

[١٠] پاشان دەستویرا شەڕی ژ (ئەردەوانی) خواست و گوتە وی جهەکی ژبۆ شەڕی دەستنیشان بکەت. (ئەردەوانی) بو وی نڤیسی ئەز بیابانێ (هورمزجان) دەستنیشان دکەم، داکو (مێهرماهـ) ژ ڕهـ و ڕیشالان دەربینیت، ئەردەشیر بەری دەمێ خوە ل دەوروبەرێن خوە چال

چـــێ بـــی شـــەڕێ ڤـــان پلنـــگ وشـــیرە
شـــێرێ صـــۆرێ نێـــر هـــەر ئـــەردەشـــیرە

وی كوشـــت ئـــەردەوان د وێ هنگـــامێ[1]
دایـــە گـــەلـــەكـــا ژ ڤـــێ تـــاس[2] و جـــامێ[3]

---

كولان و تژی ئاڤكرن. ئەردەوان و شاهـ (ئەرمەنی) كو هەر دووكان شەڕ سەرا ئاڤێ دكرن، ئاشتی كرن و هاریكاریا هەڤدووكرن و شەڕ دژی ئەردەشیری كرن. ئەگەر هاتۆ گەلێ (بابا)ی شاهێ ئەرمەنیان دژی ئەردەشیری نەڕابوو، ڕۆژەك ژ ڕۆژان (ئەردەوان دژی ئەردەشیری نەڕاوەستیا و ئەردەشیری ب نەپەنی ئاشتی ل گەل (بابا)ی گرێدا كو بەلا خوە ژ وێڤە ڤەكەت. ئەڤجا ئەردەشیر دێ خوە بو (ئەردەوان)ی بەرهەڤ كەت و گەلەك نەما ئەو كوشت و دەستێ خوە دانا ل سەر هەمی تشتێن (بابا)ی و ئەردەشیر وەك شاهێ شاهان ل قەلەم دا و پاشان بەرەڤ (هەمەزان) چوو و وێرێ ئێخستە ژێر دەستێ خوە.((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[1] د وی دەمی.

[2] ئامان.

[3] پاشان بەرەڤ دەڤەرێن چیا، ئازەربایجان، ئورمیێ ڤە چوو و ب زۆری ڤەكرن و هەتا گەهشتە بەر دیوارێ (مویسل) واتە دەڤەرا كوردستانێ (عیراق)ێ ئێخستە ژێر دەستێ خوە و (تیسفون) ل سەر كەنارێ ڕوبیارێ دیجلەی ئاڤاكر، ئەو باژێڕ دكەڤیتە ڕۆژهەلاتێ (مەدائین) كو باژێڕكێ سەیرە و ناڤێ وێ كرە (ئەردەشیر) پاشان بەرەڤ (ئیستەخر)ێ زڤڕیڤە. ژ وێرێ چوو (سجستان)، جورجان (گورگان)، نیشابوور، مەرو، بەلخ، خوارەزم و دەڤەرێن میدیا كەڤن و ڤەگەڕیاڤە فارس گەهشتە (جور) پاشان هندەك هنارتیێن شاهێن كوسان، توران، موكران (كوردان) گوهداریا خوە ڕاگەهاند. پاشان ژ (جور) دەركەڤت و بەرەڤ (بەحرینێ) چوو و شاهێ بەحرینێ نەچار بوو خوە ژ كەلهێ بهاڤێژیت و مر. پاشی ئەردەشیر زڤڕیەڤە (مەدائین) ب ساخیا خوە تانجا خوە دانا سەرسەرێ كوڕێ خوە (سابوور)ی. هەشت باژێڕ ئاڤاكرن ژ ئەوان بەحرینێ ب ناڤێ (بێهشەهر) بەرامبەری (مەدائین). (ئەردەشیر فەرە) باژێڕێ (فیرۆزئاباد) كو دبێژن (عەضودولدەلە) ب (فیرۆزئاباد)

بابـــایێ ئـــەرمـــەنـــی بـــۆ وی بـــۆ خـــادم[١]
ل پـــێش وی نـــەمـــان چـــو میـــرێ و حـــاکم[٢]

بـــی شاهنشاهـــێ هـــەمیـــا ب عـــامی
جهـــێ بـــاپیرا گـــرت و ب تـــەمـــامی[٣]

---

ناڤکریە. هەروەسا بازێرێ (ئەردەشیر) ژی ل کرمان ئاڤاکر، هەروەسا (ڕەمهورموز) خوزستان و بەهەمەن ئەردەشیر سەر دیجلەی ل دەڤ بەسرا ئاڤاکر کو خەلکێ بەسرا دبێژنێ: (بەهەمەن شیر) مێژوویا وێ باشە، سەرکەڤتی یە، چ ئالێ بەرامبەر وێ نا ڕابن، بازێڕێ بازێڕان سەروبەر کر و وەلات ئاڤاکر. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[١] خزمەتکار.

[٢] دەستهەلاتدار.

[٣] شاهێ کێ بوو ئەو بوو ئەوێ (ئەردەوان) کوشتی، هەتا چاردە سالْ و دەه هەیڤ بوورین. ئەردەشیری دەستێ خوە نەدانا ل سەر عیراقێ، گەلەك کەرەب ژ عەرەبان ڤەدبوو. مانا وی جهێ خوە دابیت، هندەك ژ ئەوان دەرکەڤتن و بەرەڤ شامێڤە چوون، هندەك دبێژن: ئەردەشیری عیراق گرت کو عەرەب ژێر دەستهەلاتداریا فارسان دابوون، و ژ ئەڤێ چەندێ ڕازیبوون. خەلکێ (حیرە) و ئەنبار گوهداریا وی کرن، دەمێ کاروبار کەڤتینە د دەستێ ویدا، ئەردەشیری کاروبار ڕێکخستن، حەفت دەستە چێکرن، یا ئێکێ: وەزیران، پاشی موبەزان (مام زان) ئەڤ پەیڤە هەتا نوکە دناڤ کوردان دا بەلاڤە واتە بۆ ئەوان کەسان دهێتە گۆتن ئەوێن ب کاروبارێن ئایینی ڕادبن کو ئەو سەرۆکێ (موبەزە). وەلاتێ (ئیستەخر) کرە چار ویلایەت یا ئێکێ: خوراسان، یا دوویێ: ڕۆژئاڤا، یا سێیێ: باشوور و یا چارێ: باکوور یانی شام. ئەڤ هەر چارە خودانێ وێ چەندێ بوون کو کاروبارێن شاهی ب ڕێڤەدبرن، هەر ئێك ژ ئەوان جودا پشکەك وەلاتی ب ڕێڤە دبرن، هەر ئێك ژ ئەوان (جێنشینێن) کو (مەرزبان) واتە نوینەرێن والی هەبوون، ئەڤە کورتیا دەستهەلاتداریا شاهێ شاهان ئەردەشیرێ کورد بوو. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

## دەقێ دوازدێ

بـــــەهرامـــــێ دووێ ئـــــەول غافـــــل بـــــێ
دووای[۱] چـــەن[۲] صـــالێ پاشـــی ب عاقـــل بـــی[۳]

رۆژەکـــــێ دەرکـــــەت نێچیـــــر و ڕاڤـــــا
ئاســـــکە ب تیـــــرا و کـــــەوان[٤] ب داڤـــــا[٥]

دەمـــا ڤـــەگـــەڕیـــا کـــو شـــەڤ هـــەیڤـــە
مـــام زان[٦] و چـــەن[۷] کـــەس هـــەمـــی بدیڤـــە

---

[۱] پشتی.

[۲] چەند.

[۳] شاه بەهڕام کوڕێ بەهڕامی کوڕێ هوڕموزی کوڕێ سابووری کوڕێ ئەردەشیرێ ئێکێ.

[٤] کڤان.

[٥] پشتی بابێ خوە بو دەستهەڵاتدار، ل دەستپێکا دەستهەڵاتداریا خوە دویف نێچیرێ و کاروبارێن خوەشیێن دونیایێ دچوو، هزرا خوە د وەڵاتی دا نەدکر. گرنگی نەددا کاروبارێن خەلکێ و هەمی تشتەك بو کەسوکار و ئەوێن دەوروبەرێن خوەکر، باج ل سەر ئەوان ڕاکر، ل دویڤ حەزا وەزیران و بەرپرسان دچوو، کاروبار ئێخستنە د دەستێن وەزیران دا، وەڵات بەرەڤ وێرانی چوو، ئاڤاکرن بەر ب کێمیڤە چوو، گەنجینە ڤالە بوو، لەشکەر بێ هێز بوون و بێن لاواز ژناڤچوون. شاه هندەك ڕۆژان سویار دبوو و بەرەڤ جهێ کەیف و نێچیرێ دچوو، جارەکێ تاریەتی بسەردا هات کو ئەو بەرەڤ مەدائین کو شەڤەکا تاڤ هەیڤی بوو دچوو. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[٦] موبەز.

[۷] چەند.



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخو بو ڤەکولینێن کوردی

دچوون[١] ئەو پێكڤە ل ناڤ هلوەشیا
گولێ بین دەنكێ بوومێ لی خۆشیا[٢]

بەهڕامی گۆتە ئەی مامێ زانا
كەسەك دزانت ب ڤان زمانا[٣]

گۆتێ شاهێ مزانی[٤] چ گۆت
بەلێ ئەز چبكم وی دلێ م[٥] سۆت

شاهی گۆتە وی بێژە كا چی یە
ئەڤ هۆپ هۆپا هە دەنگێ بوومێ یە

گۆتێ میرێ من ئەڤ بوومێ نێرە
وێ دبێژت یا مێ كا وەرە ئێرە

نێ ئەڤێندارم بۆ تە دەلالێ
ل ڤان هەرێما هەر تو هەڤالێ[٦]

---

[١] ل جهەكێ دیتر: چوونە.

[٢] ژبۆ كارەكێ فەر كو هاتبوو سەر هزرا وی گازی (موبەزی) كر و ئەو گەهشتە وی و كەڤتنە ڕێ و بو شاهی ئاخفت و وی قەبویلكر، بو شاهی باسێ باب و باپیرێن وی كر، د نیڤا ڕێكێدا، شوینوارێن وێران لێ هەبوون، گەلەك وێران ببوون، كو ل سەردەمێ مللەتێ وی بوون، چ مرۆڤێن تێدا نەبوون.

[٣] ل جهەكێ دیتر: زومانا.

[٤] من زانی.

[٥] من.

[٦] ڕۆژەك ژ ڕۆژان بوومەكێ گازی دكر و یێ دیتر بەرسڤا وی دناڤ ئاڤاهیێن وێران ددا، شاهی گۆتە (موبەزی) تو مرۆڤەكی دبینی و دشێ تێگەهشتنا ئاخڤتنا باڵندەی بدەی وی یێ ئەڤێ شەڤا بێ دەنگ و ئاڕام گازی دكەت، گۆتە وی (موبەزان) ئەزم ئەی شاهـ

بووما مێ گۆتێ کانێ مەهرا من
پاشی بگەهین ئێك ببت بەهرا من[1]

گۆتێ دەبێژە نەختێ تە چی یە
گۆتێ بیست گوندی ژ ڤان خڕابییە

بوومێ نێر گۆتێ پتر بۆ تە بت
هندی کو بەهڕام پادشاهێ مە بت

دێ دم تە گوندا هەتا ب هزارا
هندی گو بەهڕام نەکت چو چارا

بووما مێ گۆتێ ئەڤە زۆر باشە
دا ئەم ژێ بخۆین ڕزق و معاشە

دا لێ بەلاڤ بن کوڕ و کچێ مە
دا کەس نەبێژت ڕزقێ وە کێمە

---

یێ کو خودێ تێگەهشتا باڵندەی دایە من، شاهـ تێگەهشت ئەوا وی گۆتی، شاهی زانی کو ئاخفتنا وی دروستە، شاهی گۆت: چ دبێژی (موبەزانی) گۆت: ئەڤە بووما نێرە ل گەل بووما مێ دئاخڤیت و دبێژیتە وێ، خوەشیێ بدە من هەتا مە تێژك هەبن، تەسبیحا خودێ بکەن داکو ل ئەڤێ دونیایێ هندەك پشت مە بمینن و ناڤێ مە زیندی بمینیت و دلوڤانیێ بڕێژن سەر مە. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(1) بووما مێ بەرسڤدا و گۆت: (ئەوا ئەز پێ داخواز کریم، ڕێکا مەزنە و شانسێ زێدەیە د نوکە و پاشەڕۆژێدا، ئەز هندەك کاران مەرج دهاڤێژمە بەر تە، ئەگەر تو بدەیە من ئەزێ بەرسڤا تە دەم ئەوا تە ژ من داخوازکری، گۆتە وی: ئەو چ کارن وێ گۆت: ئەگەر من خوە بو تە حەلال کر و هاتم ئەوا تە داخواز کری. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

گاڤـا گـولێ بـی بـەهرامـی ئـەڤـە
گۆتـــە هـــەڤـــالا دا ب زڤرینـــەڤـــە[1]

دەمـــا زڤـــرین گـــۆت مـــام زانـــی
دیـــن و دوینـــا خـــوە مـــە ژ دەســـت وە زانـــی

کـــانێ بـــەیـــان کـــە ئـــەڤـــان گۆتنـــا
گۆتنـــا گێـــورە بـــەحـــرا بـــێ بنـــە

ئـــەز نقســـتی بـــووم تـــە ئـــەز هلینـــام
ئـــەزێ مـــری بـــووم تـــە ئـــەز[2] ڤـــەژینـــام

تشـــتێ ژ مـــن دوور تـــە نێزیـــك م[3] کـــر
سپاســـی بـــۆ تـــە ئـــەڤ تـــە چکـــر[4]

---

(1) یا ئێکی تو لاوترین بیست گوندێن وێران بدەیە من ئەوێن ل سەردەمێ ئەڤی شاهی وێران بووین، شاهی گۆت: کێ گۆتە وێ؟ بووما نێر یا گۆتێ وێ، موبەزانی گۆت: ئەو ئاخڤتنا وێ بوو: ئەگەر ڕۆژێن ئەڤی شاهێ خوەشبەخت درێژ بوو، ئەزێ هزاران گوندێن وێران دەمە تە، بووما نێر گۆت: تو دێ چ لێ کەی، ئەوی گۆت: ئەگەر ئەم چووینە دەڤ ئێك دێ دویندەهـ زێدە بیت و دێ هەر ئێکی گوندەکی ژ ئەڤان گوندێن وێران دەینێ، گۆتە وێ ئەڤە بسانەهیترین کارە تە ژ من داخوازکری و فەرمانەکا سانەهییە تە ژ من خواستی و من ئەو سۆز داتە و ئەز تێر و تژیمە ب ئەڤێ چەندێ کا دێ پشتی ئەڤێ چی بیت. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(2) ئە.

(3) من.

(4) دەمێ شاهی ئەڤ ئاخڤتنە ژ (موبەزان) بهیستی، دلێ خوەدا گۆت و ژ خەوێ ڕابوو و هزرا خوە د ئەوان ئاخڤتنان داکر و پەیا بوو، و ب پیان نك خەلکێڤە چوو و (موبەزان) ڤاڕێکر و گۆتە وی: (ئەی ئەوێ تو ب ئایینی ڕادبی و شیرەتکارێ شاهی و هشیارکەر

گـــۆتێ بگـــەهـــت تـــە بـــەرز و بلنـــدی
مللـــەت بژیـــت هـــەر بـــە بـــاش و ڕنـــدی

چیـــروك م[1] گێـــرا ب ڤـــی كراســـی
ب زمـــانێ بـــوومی دا خـــۆ بناســـی

گـــۆتێ مـــام زانـــا تـــو بـــاش بـــەیانكـــە[2]
چیـــا[3] نـــزانم ل مـــن عـــەیانكـــە[4]

وی گـــۆت میـــرێ مـــن میـــر نـــابتن میـــر
مـــەگـــەر ب دیـــن و گوهـــدان و تـــەدبیـــر[5]

---

ل سەر وی تشتێ ژ ئاقل د كاروبارێن وەلاتیدا و ئەو (غافل) بوو ژ كاروبارییێن وەلاتی و خەلكێ. ئەڤە چ ئاخفتن بوون تە گۆتینە من، ئەوا ئەز لێ ڕاوەستیام و تە زانین نیشانی من دای ئەوا ئەز ژێ دویر. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(1) من.

(2) ڕۆهن، دیار.

(3) هەر تشتا.

(4) بەرچاڤ، ئاشكرا.

(5) موبەزانی گۆت: (ئەی شاه یا كەڤتی دەستێ تە وەلاتەكێ ب خوەشی و خوەشبەختی بو خەلكێ و وەلاتی، تە ئاخفتن كرە نموونە و هشیاركرن ل سەر زمانێ باڵندەیێ ل دەمێ داخوازیا شاهی ژ بەرسڤا ئەو پرسیار هاتیەكرن، شاهی گۆتە وی: ئەی شیرەتكار، ئەڤێ مەبەستێ ئاشكرا بكە ئەوا تە گۆتی و ڕامانا تە مەرەم پێ هەی، مەبەست پێ چیە و چ شرۆڤە پێ هەیە؟ موبەزانی گۆت: ئەی شاهێ خوەشبەخت، خوەشبەختیا شاهی ناهێت ئەو تێنە ب گوهداریا خودێ ڕابی و ئەركێن وی بجهبینی و هەمی تشت ژێر فەرمانا خودێ دابیت. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

سەرێ هەر تشتی عەدل و حەقی یە
ژ بوونا خودێ ئەو ڕێیا وی یە

خودێ میر کرن مەزن ل ئەردێ[1]
نابت چو جارا حەقیێ تو بەردێ[2]

بەهرامی گۆتێ تشتێ تە گۆتی
هەمی هەر وەیە دلێ مسوتی[3]

کا بەیان بکە ئەڤان گۆتنا
تشتێ تو بیژێ ئامانجا منە

گۆتێ تە زەڤی برن ژ خودانا
تە دانە دەستێ خزم و نەزانا

ئەوان هەر ڤیا داکو فایدەکن
جهێ خڕابی ئەو ئاڤا نەکن

نە دانە ئەوان چو خەرج و خەراج
ما ڤە[4] خەزینە[5] بێ پارە و باج

---

(1) ل ئەرچێ، هەردی.

(2) ڕاوەستیانا شەریعەتی نینە و ئەو تێنە ب شاهی بیت، غیرەت ژی بو شاهی نینە ئەو تێنە زەلام هەبن و ڕاوەستیانا زەلامی ژی نینە ئەو تێنە ب سامانێ و چ ڕێك بو سامانی نینە ئەو تێنە بو ئاڤاکرنێ نەبن و چ ڕێك بو ئاڤاکرنێ نینە ئەو تێنە ب دادپەروەریێ بیت و دادپەروەری چی یە ئەو ترازیە ئەوا دانای دناڤبەرا خەلکێ دا و خەلك دانای و ژبۆ شاهی گێڕایە. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(3) من سۆتی.

(4) ما ئەڤە.

(5) گەنجینە.

جوتیار و شۆلکەر نێ دەربدەربوون
لەشکەر و مللەت ئەو بێ مەفەربوون[1]

نەیارا پێکڤە بەرێ خۆ دامە
دەما کو زانی چو مال نەمامە

چاخێ بەهرامی ئەڤە چوو گوها
دەبیر[2] کومکرن ژ هەمی جها

سێ رۆژا بۆ وە دگەل وا کومکەر
دیوان و دەفتەر هەمی ئینا دەر[3]

زەڤی ئو ملك و گوند دان خودانی
ژ دەستێ خزما هەمی دەرانی

خڕابێ گوندان و ئاڤا ڤەبوون
خۆشی و مال و زێڕ ل وان زیدەبوون

---

(1) بێ رێ بوون.

(2) زانا و نڤیسەر.

(3) باج و خویك بۆ ئەوان کەسان بوون ئەوێن نێزیکی شاهی، نەخوەشی کەڤتە ل سەر ئەوان کەسان ئەوێن باجان ددەن و خانیێن ئەوان کاڤل بووین و جهێن خوە بەردایین و بەرەڤ جهێن نەدیار چووین و مانە تێدا، لێ ئاڤاهی کێم بوون، خەلکێ کرە هەوار و گازی و خەلکێ (تەماعی) د وی ئەردی دا کرن ئەوێن ب شاهان و مللەتانڤە گرێدایی، بەلکو ب تشت کێم بوونێ ئەوا کو ب وی وەلاتی پێ ئاڤا دبیت. دەمێ شاهێ ئەڤ ئاخڤتنە ژ موبەزانی بهیستی، سێ جاران ل جهێ خوە ڕابوو، هەمی وەزیر، نڤیسەر، خودانێن توماران و هەمی تومار کومکرن. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

لـەشـكـەر ب هيـز كـەت بـەلـەنگـاز نـەمـان
نـەيـار ڤـەمريـان كـەسـەك ژێ نـەمـان

ل سـەر هـەر شـۆلێ ميـر دبوويـە پـەيـدا
ژيانـا ميـرى ڕۆژانـى عـەيـدا[١]

---

[١] وەلات ژ دەستێ كەسانێن تايبەت و دەوروبەر دەرهينان و بو خودانان زڤڕاندنەڤە و ل سەر ڕەوشا خوەيا كەڤن مان و دەست هاڤێتە ئاڤكرنێ، يێ لاواز ب هێز كەڤت و وەلات ئاڤا بوو و ئەرد شينبوو و سامان و باج زێدە بوون و لەشكەر و ئەردێن دوير ب هێز كەڤتن، شاهى سۆزدا كو ئەو ب خوە ب كاروباران ڕابيت، د هەر دەمەكيدا و چاڤدێريا كاروبارێن كەسانێن دەوروبەر و يێن ديتر بكەت. ل سەردەمێ وى كاودان بەرەڤ باشيێ ڤە چوو، وەلاتێ وى ڕێكخستى لێهات هەتا دهێتە زانين كو ل سەردەمێ وى خوەشى، دادپەروەرى و بەرفرەهى بوو. ((ژ تيبينيێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ ديوانێ ب زمانێ عەرەبى هاتيە وەرگێڕان)).

## دەڤێ سێزدێ

بـــەهـــرام هاتـــە دونيـــايێ بـــابێ وی دايـــە مونـــذر
ئـــەوی بـــرە حيرايـــێ[1] ل نـــاڤ عـــەرەبـــا خـــودان كـــر

سـێ ژنـا شـير دا بـەهـرام ئيـك عـەجـەم و دوو عـەرەب
لـەش ساخ و زانـا و زيـرەك و خـودان ئـەصڵين ب نـەسـەب

سـێ صـالێ وان شـير دايـێ بـاش و تـازە خـودانكر
پـاك و تـەميـز و پـاقژ ب ڤـێ جـۆری وان ڕاكـر[2]

دەمـا گـەهشـتە پێنجـێ سـەيدايـەك بـۆ وی ئينـا
نڤيسـين و سـەگڤـانی و شـەريعـەت ئـەوی خۆينـا

زانايـەكـێ فارسـی بـۆ بـەهرامـی خـەبـەردا
بـەهرامـی ب ئاسـانی ژ وی گـرت و نـەبـەردا[1]

---

(1) ئێك ژ باژێرێن كەڤنێن عيراقێ يە و دكەڤيتە نێزيكێ نەجەف.

(2) شاهـ بەهرام جۆر كوڕێ يەزدەجری كوڕێ بەهرامی كوڕێ سابووری كوڕێ ئەدەشيری ئێكێ. دەمێ يەزدەجيری (بەهرام) بووی، ژبۆ ماتيژێكرنا وی (عەرەب) هلبژارتن، هنارتە ل نك (موندر كوڕێ نەعمان)ی ئەو ب خودانكرنەكا هەژی خودانكر و كرە شاهێ عەرەبان، (موندر) چوو و سێ ژنك بو شيردانا وی هلبژراتن كو خودان ساخلەميەكا باش و هزروبيرێن باش و خودان ڕەوشتێن پاقژ ژ كچێن كەسانێن مەزن و ماقويل كو دوو ژ ئەوان عەرەب و ئێك عەجەم بوو، بو ماوێ سێ سالان شير دانە وی. ((ژ تيبينيێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ ديوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتيە وەرگێڕان)).

دەما بوویە دازدە[٢] صاڵ تشتێ پێڤێ[٣] وی زانی
ل پێستركا زانیاری بلند بی چوو سەر بانی

سەیدایێ سوویارێ هات سوویاری نیشادا
وی كەحێلا عەرەبی وەكی مسعاری بادا

فەرمانەك دا موندری هەمی هەسپا كوم بكن
ژبۆ دلێ بەهرامی دا ئەم غاردانێ[٤] بكن

هەسپێ شەزەری موندر ل هەمی هەسپا زێدەكر
ب دەستێ خۆ موندری نێزیك بەهرامی ڤەكر

لێ سوار كر و گۆتێ هەرە نێچیر و ڕاڤێ
بكە كەیف و سەیرانێ هەرگیز[٥] تو تیرا باڤێ

چوویە نێچیرێ بەهرام دیت بڕەكا[٦] وەحشیا
تیرەك وی ئاڤێت وان لێدا وەكی وی دڤیا

دەما چوو نێزیكی وان وی دیت شێرەكێ مەزن
شەڕ دگەل وا كەرا كا كێوڤییەك كەڤتە بن

بەهرام ڕابی سەرپیا لێدا تیرەكا دژوار
هەر دوو پێكڤە كونكرن تیرەك عەردی چوویە خوار

---

(١) دەمێ بوویە پێنج ساڵ، دوو پەروەردكار بەرهەڤكرن و ئەو فێری خواندن و نڤیسینێ و شەریعەتی كر، ئاقلدارەك ژ ئاقلدارێن فارسان هینان فێری هەمی تشتەكی كر. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(٢) دوازدە.

(٣) پێدڤی.

(٤) بەزن.

(٥) ئێكجار.

(٦) كومەكا.

هەڤال و هوگر هەمی مەندەهۆشێ بەهرامی
کەسەك نینە هۆ ب هیز نە ژ خاص و نە عامی[1]

بەهرام ل نك موندری بابل مەدائینی مر
پەیمان دا مەزنا ئەوان تەدبیرا خۆ کر

ئەم بەهرامی نا راکین رێ و رەوشت عەرەبی
بابێ وی زۆری پیس بی کوتەك ئەوێ ژ مە ڤەبی

وان کرە میر ئێکە دی ژ پاشمائی ئەردەشێر
د گۆتنە وی کەسرا خۆش مروڤ و سەرەمێر

دەما بەهرامی زانی بابێ وی چوو فەنایێ[2]
موندر و نەعمان ئانین ژبۆ تەدبیر و رایێ

موندری گۆتێ مەترسی تا ئەز ل وان فێلێ کم
دەه هزار ژ سووارا ب نەعمانی ڤە رێکم

موندری گۆتە نەعمان هەرن هوون طەیسەفونێ
بەهرشیرێ دەوردن نەراوەستی و نەرونێ

---

[1] پشتی بوویە دوازدە سالٚ فێری هەر تشتەکی کر ئەوا وی دخواست و دا پێشیا ماموستایێ خوە، ماموستایەکێ سویار بوونێ هینا و هەر تشتێ پێدڤی بوو ژ وی وەرگرت، پاشی (موندر)ی فەرمان دا هەسپەکێ عەرەبی بو وی هینا و د بەریکانێ دا هەسپەکی بەراکر و هەسپێن دیتر ژی هاتن، (موندر)ی هەسپ دایێ و ژبۆ نێچیرێ لێ سویار بوو و تشتەك کەڤتە د رێکا وی دا دەمێ سەحکرینێ ئەو شێرە ژ وی دەرباز بووی، بەهرامی تیرەك هاڤێتە شێری و ب شێرێ کەڤت و درێژ بوو ئەردی و ئەوێن ب چاڤ تەماشا کرین مانە حێبەتی و بەردەوام بوون ل سەر چوون و خوەشیا خوە. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێران)).

[2] مری.

تشتێ بابێ وی گۆتێ ئەوی هەرگیز[١] وەسا كر
كوشتن ژ فورسێ[٢] گەلەك ل وان قیامەت ڕاكر

مەزنێ فورسێ كوم ڤەبوون ئەوان گۆتە حەوابی
تو[٣] هەرە نك نەعمانی فەرە ب ڤێ تو ڕابی

حەوابی چوویە حیرە دا موندرێ ببینت
ئەوا نەعمانی كری داوی تێبگەهینت

دەما گەهشتە وێرێ موندرێ گۆتێ ڕابە
هەرە بۆ نك بەهرامی ل خدمەت وی پەیا بە

چوو نك بەهرامی و طرسا وی دیت وەك ئەژدەهایە
نە هات بیرا وی سوجدە هۆش ل سەری نەمایە[٤]

---

(١) ئێكجار.

(٢) فارسان.

(٣) ڕابە.

(٤)بابێ وی مر و ل نك (موندر)ی بوو، مەزن و كەنكەنێن فارسان سۆزدا كو كەسەك ژ دویندەها (یەزدەجیر)ی نەبیتە شاه، ئەڤە ژی بو نەباشی و ڕەفتارێن نە دروستێن وی دزڤرن. سەر وی چەندێ ڕێككەڤتن كو ل ناڤ عەرەبان یێ مەزن بووی و ئەخلاقێ ئەوان یێ گرتی، چونكی ئەو كوڕێ (یەزدەجیر)ی بوو، ئێك ژ دویندەها (ئەردەشیر كوڕێ بابەكی) كو دگۆتنێ (كیسرا) و (یەزدەجیر) ب داوی هات. هەمی كاروبارێن (كیسرای) كرنە د دەستێن بەهرامی دا و گازی كرە (موندر)ی و كوڕێ وی نەعمانی و مەزن و كەنكەنێن عەرەبان و گۆت: بابێ تە گەلەك قەنجی و جوامیرێ یێن ل مە كرین، ب دژۆاری ئەڤ چەندە وەرگرت و ئەڤە گۆتە ئەوان، (موندر)ی گۆت: چ ترس بۆ تە نینە و هەتا (فێلبازی) دیاربووی و دەه هزار سویار ئامادەكرن و بەرێ ئەوان دا (تیسفون و بێهشەهر). شاهی دەستویر دا (نەعمان)ی كو لەشكەری داننە دەوروبەران و ژبۆ كونترۆڵكرنا ڕەوشێ زێرەڤانان ڤرێكەنە دەوروبەران، شەڕێ ئەوان بكەی یێ شەڕێ

بەهرامی زانی ئەڤ ڕەنگ پەیمانەك دا حەوابی
گۆتێ هەرە نك موندر دەما تو ژ ڤێرێ ڕابی

موندری گۆتێ بەهرام نەعمان ڕێکر جهێ وە
چنکی پشتی بابێ وی خودێ ئەو کر میرێ وە

دەما گۆتن گولێ بی ژ موندری ب تەمامی
هاتە بیرا وی ئەوا وی دیتییە ژ بەهرامی

زانی ڕەئی و تەدبیرێ فورسێ هەمی بێ بن
نەشین ل پیش بەهرامی ئەو هەمی بسەکنن

ئەوی گۆتە موندری وەرە تو شەهرێ میرا
دا دگەل من و سەرۆکا پێکڤە بکین تەدبیرا

موندرێ عەرەب ئینان سێ هزار سویارکرن
ئەو هاتە بۆ مەدائن فارس هەمی کومکرن

مینبەرەك زیرێ ئینا لی ڕەشاندی جەواهر
چوو سەر مینبەرێ بەهرام دەڤ وەکی پێت و ئاگر

ئاخڤتن دگەل فارسا ئەوان گۆتە بەهرامی
زۆرداریا بابێ تە ل فارسا ب عامی[١]

---

هەوە دکەن و گوهورینا د وەلاتی دا بکە و ئەڤ چەندە کر، مەزن و ماقویلێن فارس (حەوابی) خودانێ کاغەزەێن (یەزدەجیر)ی هنارتنە دەڤ (موندر)ی داکو فەرمانا (نەعمان)ی نیشا ئەوان بدەن، دەمێ (حەواب) گەهشتی، (موندر)ی گۆت: شاه بەهرامی بهاڤێژە، چونکە ئەو گۆتێ ئەو ژێ دیت ئەوا ژێ نەدیتی مەزناتیا لەشێ و جوانیا سەروچاڤێن وی، یێ دویر بوو ژ ڕێزگرتنێ. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[١] بەهرامی ئەڤە زانی، ب نەرمی ل گەل ئاخڤت و باشتیرین سۆزدایێ و ژبۆ (موندر)ی زڤڕاندەڤە و (موندر)ی گۆتە وی: شاه بەهرامی، نەعمان ڤرێکریە دەڤەرا هەوە کو

بەهەرام گۆتە وان ڕاستە ئەز ژ وی نەڕازی مە
هەمی دەما[١] ژ یەزدان ژبۆ خۆ دوعا چی مە

گو یەزدان م[٢] بکت میر دا ڕاست بکم خواریێ
پاڤژ کم شوینواری وی دابشوم ژ پسییێ

ئەگەر صالەکێ بیم میر م[٣] پەیمان ب جەنەینا
بێ کوتەکی ب دلێ خۆ میری نیا وە مە دەینا

هوین دبینن خەمل و تاجا ل ناڤ بەینا دوو شێرا
ئەوێ چوو هەر دوو ئینان دێ ئەو بت میرێ ڤێرە

مام زانێ مەزن هات تاج و خەمل وی ئانین
ل ناڤ بەینا دوو شیرا وە کی واگۆتی دانین[١]

---

خودێ ئەو مولك دابوو وی، دەمێ (حەواب)ی گۆتنا (موندری)ی زانی و هینا بیرا خوە، ئەوا بەهرامی کری، و هندی ڕاوێژکاری کری و وەلات ژ بەهرامی ڤەبیت، گۆتە (موندر)ی هەرە باژێڕێ شاهان دێ مەزن و ماقویل ل تە کوم بن و تو ڕاوێژکاریێ د ئەڤی بیاڤیدا دگەل واندا کەی و ئەو وی تشتی ناکەن ئەوا تو دبێژی. پشتی (موندر) ژ دەڤ (حەواب)ی زڤڕیڤە سیهـ هزار سویارێن عەرەب ل گەل ویدا بوون دانە ڕێ، خەلك ل هەر دوو باژێڕێن شاهـ بەهرامی کۆمکرن و چوو سەر مینبەرەکا کو ب زێر و تشتێن گرانبها هاتبوو خەملاندن، مەزن و ماقویلێن فارسان ئاخڤتن و نەباشییێن (یەزدجر)ی بابێ بەهرامی هینانە بیرا وی و ڕفتارێن نەباش و کوشتنا وی یا زێدە وێرانکرنا وەلاتی و هەر ژبەر ئەڤێ چەندێ شاهاتی ژ بەهرامی ستاند. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[١] ل جهەکێ دیتر: گاڤا.

[٢] من.

[٣] من.

بـــەهرامـــی گۆتـــە كـــەســـرای هـــەرە هـــەر دووا بینـــە
كـــەســـرایێ گۆتـــە بـــەهـــرام تـــو میرنییـــێ بســـطینە

ڕاكـــر بـــەهرامـــی گـــورزەك چـــو خـــەمـــل و تاجـــا بینـــت
شـــــێرەك ژ وان هـــــاتە وی دا ئـــــەو ڤـــــەدڕینـــــت

بـەهـرام سـویار بـی ل وی بـۆ گوهـ گـرت و لـێ زڤڕانـد
ئـــــەوی بـــــە هـــــەر دورانـــــا پـــــەرا ســـــولوی قڕانـــــد

دەینـــا ســـەری بـــە گـــورزا شـــێرێ دی هاتـــە هـــاری
هـــە ردوو گـــوهێ وی گـــرتن ڕێ نـــەدا وی نـــەیـــاری

ســـەرێ هـــەر دووا لێكـــدا مـــە ژی ژ گوهـــا دا ئـــینا
هـەر دوو كوشـتن بـە گـورزا خـەمـل و تاجـا وی هلینـا

كـەسـرا و سـەروكـێ فورسـێ هنـدی كـوم بـوون ژ عـامی
مـەنـدەهـۆش مـان و هـاتن سـوجدە بـر بـۆ بـەهرامـی

دەمـا بـەهـرام بوویـە میـر عـومرێ وی بوویـە بیسـت صـال
فـــەرمانـــەك دا مللـــەتـــی بـــژین ب خـــۆشی و دەلال

دائـــیم خـــودێ نـــاس بكـــن هـــوین ژ ئـــەوی بترســـن
كـار و پیشـێ خـۆ بكـن هـوین قـەد ل مـن نـەپرسـن[٢]

---

[١] بەهرامی گۆت: ژ هەوە پشتڕاستم و من دڤێت ل سەر ئەڤێ مژارێ زێدە كەم و بەردەوام دوعا ژ خودێ دكەم ئەوا ژناڤچووی زڤڕینتەڤە. هەروەسا ئەگەر ئەز هاتم سەر دەستهەلاتێ و سالەك ببووریت و سۆزا خوە نە هینا و ئەزێ دەستێ ژ حوكمڕانیێ بەردەم و ئەز ڕازیمە تاج و پەڕگارا لاوینیێ دناڤبەرا دوو شێرێن درندە دا دانم و كا كی دێ بو خوە ڕاكەت، دەستهەلاتداری بو وی یە، بەرسڤا وی دا و تاج و پەرگارا لاوینیێ دانانە دناڤبەرا دوو شێران دا. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[٢] (موبەزان) بەرهەڤكر، بەهرامی گۆتە كیسرای نەبوو تەیە تاج و پەرگارا لاوینیێ، كیسرای گۆت: تو ژ من پێشتری و تە داخوازا دەستهەلاتداری كر كو شاهاتی پشتا پشت بو تەیە، من یێ بو خوە ستاندی و بەهرامی كەفەكا شفتانان هینان و بەرەڤ

شـــــۆلێ وی بوویـــــه یـــــاری هــــــەر ل ڕاڤ و نێچیــــرا
ل وی گــەمـا بــوون نـەیـار کـەتـن حیلـە و تـەدبیـرا

ئــــەول هاتــــە وی خاقــــان نــــێ ئـــەو میــــرێ تورکــــابی
دوو صــــەد و پیـــنج هـــزار ســـوار دگــــەل وی ڕابـــــی

بــەهرامــی خــو پیکئینـــا[(١)] چــوو بــۆ ئــەزرباجــانێ[(٢)]
دا ئــــــەو بکـــــت نڤێــــژا ل پێشـــــی ئـــــاگردانێ

ل خاکـــــا ئـــــەرمــــەنینـــا چوویـــــه ڕاڤ و نێچیــــرا
دگـەل وی هـەفت[(٣)] کـوم هـەبـوون هـەمـی ژ مـەزن و میـرا

هلبــــژارن وی دوو صــــەد هـــــەمــــی ژ پـــــەهلـــەوانـــا
نرســــینێ برایــــێ خــــۆ ئینــــا ل شــــوینا خــــۆ دانــــا[(١)]

---

تانجێ ڤە چوو شێرەك ژ ئەوان نك ویڤە چوو، بەهرامی خوە هاڤێتە ل سەر پشتا شێری و هەر دوو پێن خوە ل تەنشتێت وی دا، پاشی شێرێ دیتر هاتێ و هەر دوو گوهێن شێری گرتن و سەرێ خوە ل سەرێ شێرێ دیتر دا هێنگێ ڕاوەستا هەتا مەژی د سەرێ ویدا هینایین و ب شڤتانان کوشتن و پاشی تاج و پەرگارا لاوینیێ ب دەستێ خوەڤە هینا و کیسرا ئێکەمین کەس بو گوهداریا وی کری و تەڤایا بەرهەڤبوویان ڕازیبوونا دیارکر کو بەهرام ببیتە شاهـ، مەزن و وەزیر و کەنکەنان پرسیار ژ (موندر)ی کر داکو ل گەل بەهرامی باخڤیت و کو ل ئەوان ببووریت، (موندر)ی پرسیار ژ بەهرامی کر و بەرسڤا وی دا کو شاهـ بەهرام د ژیێ بیستێ دابوو، فەرمان دا کو گرنگیێ بدەتە خەلکێ و ل گەل ئەوان ڕوینیت و سۆزا دا ئەوان ب خێر و خوەشی بدەتە ئەوان و فەرمان دا ئەوان (تەقوا خودێ) بکەن. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(١) ل جهەکێ دیتر: خۆ پێکئینا بەهرامی.

(٢) ئازەربایجانێ.

(٣) حەڤت.

فارسا گۆتە یەكتر بەهرامی مە وی د ڕەڤت
ژ جەنگا ڤی خاقانی بێ گومان ئەو دێ كەڤت

بەهرام ژ ئەزرنجانێ[٢] دەركەت چوو سەر خاقانی
خاقان كوشت د وێ جەنگی دەست ل سەر تاجێ دانی

كوشتن ژ توركا[٣] گەلەك گەلەك ژی ڕەزیل كرن
منداڵ و مال و ژنان هەمی ل وان دیل كرن

ئەوێ گرتن جهێ توركا[٤] مەرزوبان[٥] ل سەر دانی
تورك[٦] هەمی بوونە تابعێ خەراج[٧] ژبۆ وی ئانی[١]

---

(١) ماوێ دەستهەڵاتداریا وی كارتێكرن (لەهوێن) دونیایێ ل سەر ئەڤان تشتان هەبوو هەتا شاهێن دەوروبەر (تەماعی) د وەڵاتێ وی دا هەبوون. ئێكەم كەسێ نك ویڤە چووی، شاهێ توركان بوو كو دوو سەد و پێنجی هزار ژ توركان ل گەل دابوون، ئەڤ چەندە ژبۆ فارسان گەلەك یا مەزن بوو، مەزنێن ئەوان چوونە نك بەهرامی و هوشداری دایێ، لێ ئەو ل سەر (لەهوا) خوە بەردەوام بوو و لەشكەرێ خوە لێكدا و بەرەڤ ئازەربایجانێ ڤە چوو و خوە هاڤێتە د ناڤ (ئاگردانێ) دا و خوە ڤەشارت« دبیتە جهێ باوەریا حەفت مالباتان و سێ سەد ژ كەسانێن بهێز و هاریكار و برایێ خوە (نرسی) ل شوینا خوە هێلا و ژبەر نەیارێن خوە ڕەڤی. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(٢) ئازەربایجانێ.

(٣) ل جهەكێ دیتر: تركا.

(٤) ل جهەكێ دیتر: تركا.

(٥) ل جهەكێ دیتر: مورزوبان.

(٦) ل جهەكێ دیتر: ترك.

(٧) باج و خویك.

هـــەرێمـــا پشـــت ڕووبـــاری ســـەرقولـــەك وی ڤرێكـــر
مـــال و مـــروڤ دیـــل كـــرن شـــۆلا وا تـــازە چێكـــر

ئـــەوی نرســـیێ بـــرا كـــرە ســـەرۆكـــێ هێـــزان
گـــۆتێ هـــەرە بـــۆ بـــەلـــخ بنگاهـــ[٢] بـــۆ تـــە خوراســـان

ئـــەوی زانـــی كـــوم ڤـــەبـــوون ژ دەیلـــەمـــا زۆر گـــەلـــەك
پلامـــار[٣] دانـــە ڕەهـــێ خـــەلكـــێ وێ كوشـــتن گـــەلـــەك[٤]

---

(١) ب شێوەیەكێ گشتی هەلویستێ ئەوان ل سەر وێ چەندێ ئەو بوو، كو دەستهەلاتداریا (خاقانی) قەبویل بكەن و ژبەر ترس و مرن و سامانێ وەلاتی خوە و باجێ بدەنە وی و ئەڤ چەندە گەهاندە (خاقانی) و بەرەڤ دەڤەرا ئەوانڤە چوو. بەهرام ب هێزەكا مەزنڤە ژ ئازەربایجانێ بەرەڤ (خاقانی) ڤە چوو و شەڕكر و ب دەستێ خوە (خاقان) كوشت و هندەك ڕزگار بوون، بەهرامی هزرا خوە د داخوازیا ئەواندا كر، كوشتن و دیل و دەستكەڤتێن ئەوان هینان و ب سلامەتی و سەركەڤتیانە ل گەل لەشكەرێ خوە زڤڕینەڤە ب ئەڤێ چەندێ بۆ خودانێ تاج و پەرگار و بەشەكێ وەلاتی. (مەرزبان) ل شوینا خوە دانان و هنارتیێن تورك ب پەیاما گوهداریكرنێ چوو دەڤ وی و سنوورەك دناڤبەرا ئەوان دانا كو ئێدی پاشڤە نەزڤڕن. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(٢) بنگەه.

(٣) هێرش.

(٤) سەركردەك ژ سەركردێن خوە هنارت و بەهرام پشتی كوشتن و هینانا ژنان و دەستكەڤتان زڤڕیەڤە عیراقێ و برایێ خوە ل شوینا خوە ل خوراسانێ دانا و فەرمانا وی دا بچیتە (بەلخ) و پەیوەندی ب وی كر كو هندەك ژ مەزنێن (دەیلەم) هژمارەكا زێدە ژ لەشكەرێن كومكری هێرش برنە (ڕەی) و دەوروبەران د ئەنجامدا گەلەك دەستكەڤت و دیل هینان و وەلات وێرانكر. سەركردێن نەشیان بەرەڤانیێ ژ سنووران بكەن و بریاردان كو باج و خویكێ سەر ئەوان سەپاندن و ئەڤ چەندە ژبۆ بەهرامی گەلەك مەزن بوو. (مەرزبان) ل گەل هژمارەكا زێدەیا لەشكەریان ب مەرەما دانانا باجێ ل سەر

مەزنی دەیلەما دیل کر پاشی بۆ خۆ کر هەڤال
زانیێ مێرەکێ باشە خۆش مروڤ و شیر حەلال

بەهرامی گۆتە نرسی دێ چم هندێ ببینم
وەختەکی زۆر درێژ ئەزێ ل ویرێ مینم[١]

چوویە هندێ ب دزیڤە هندیا ئەو نەناسی
ل نک وان ئاشکرا[٢] بی ب مێرانی[٣] و مێرخاسی

فیلەك هار بی ل وی جهی گەلەك مرۆڤ دڕاندن
بەلنبوزێ خۆی درێژ گەلەك سەر وی ڤڕاندن

---

(دەیلەم) چوونە (ڕەی) کو (تەماعی) د ئەوان دەڤەران دا هەبوو و ئەڤ چەندە کر، دەڤەرا (دەیلەم) هێزێن خوە خڕڤەکرن و بەرەڤ (ڕەی) چوون، تەڤایا باژێڕان هنارتی ڕەوانەی دەڤ بەهرامی کرن کو ژ ئەڤێ بابەتی ئاگەهدار کر و بو وی نڤیسی و فەرمانا ویدا کو بەرەڤ (دەیلەم) ڤە بچیت و جهەك بو وی دەستنیشانکر کو وی ل وێرێ بمینیت و پاشان چوو و هندەك ژ کەسانێن نێزیك چوون و ل وی جهی کەهشتن لەشکەری. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[١] دەیلەمیان ئاگەهداری گەهشتنا وی نەبوون، بەهرامی هەڤالێن خوە ڤەشارتن و بەرەڤ دەیلەمڤە چوو و گەهشتن ئەوان و دەست ب شەڕی کرن و سەرۆکێ ئەوان دیل کر و لەشکەرێ وی ڕەڤیان و بەهرامی دەستویر دا و گازی ئەوان کر و باوەری دا ئەوان هەکە بزڤڕن، ب ئەڤێ چەندێ هەمی دەیلەم چوونە دەڤ وی و کەسەك ژ ئەوان نەکوشت و قەنجی وباشی ل گەل ئەوان کر و زڤڕینەڤە و ب باش بوونە گوهدارێن وی و هەر سەرۆکێ ئەوان جارەکا دیتر بو سەرۆکێ ئەوان. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[٢] ل جهەکێ دیتر: ئاشکەرا.

[٣] ل جهەکێ دیتر: مێرینی.

دەما بـەهرامـی زانـی ب ڤـی فیلـێ گورگـەمێش
ڤیـا بچـت ببینـت بـە مێرانـی بچـت پـێش

بـەهـرام و ئیکـێ هنـدی چوونـە جهـێ فیلـێ هـار
ئـێ هنـدی ژ طرسـا خـۆ بلنـد بـی چوویـە سـەردار[۱]

بـەهرامـی کـرە ڤێـر ڤێـر دا فیـل ل وی دەرکـەڤـت
ئومێـد ئـەو قـەوی بـۆ دێ ل شـەرێ وی سـەرکـەڤـت[۲]

---

[۱] دەمێ سەرکەڤتن ل سەر دەیلەمیان تومارکری و داخوازا هاریکاری ژ (نرسی) کری کو ب نەپەنی دێ چیتە هندێ و بەرەڤ هندێ ڤە چوو کو کەسەك وی نەنیاسیت و ژبلی هندیان و کوشتنا وی بو درندەیان پاشی فیلەك پەیدا بوو و رێك گرت و گەلەك مرۆڤ کوشتن و خوە نیشا وی دا (شاهی ئاخڤتنا وی زانی) هنارتێ داکو لەشکەرێ بینیت و بەهرام ب دویماهیك هات، یێ هندی چوو جهێ بلند، فیل دەرکەڤت و دەنگەك بلند لێ بوو و دەمێ نێزیکی وی بووی، تیرەك هاڤێتێ و دناڤبەرا هەر دوو چاڤێن وی دا، و پاشان هندی شیایی دا بەر شیر و دەربان و سەرێ وی هەژاند. ((ژ تیبینیێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

[۲] یێ هندی ئەو تشت گۆتە شاهێ خوە ئەوا ب چاڤ مێزەکری، گەلەك رێز ل وی گرتن، پرسیار ژ وی کر کو هندیکە شاهێ فارسە گەلەك کەربێن وی یێن ژێڤە بووین، رەڤی و چوو، ئەڤی شاهی نەیارەك هەبوو و بەرەڤ نك ویڤە چوو و تەسلیمی وی بوو و ئەو ببیتە گوهدار و وی و باج و خویکێ بدەت، بەلێ بەهرامی قەبویل نەکر، ئیماژە ب وێ چەندێ دا کو شەڕی ل گەل وی دا بکەت، دەمێ گەهشتین هەڤدوو بەهرامی گۆت: سنوورڤانێن هندی پشتا من بگرن و چ تشتێن دیتر ل سەر هەوە نینە و پاشی دەست ب شەڕی کر و تیر هاڤێتە ئەوان و هەتا ئەو شکەستن و هەڤالێن بەهرامی هەر چ تشتێن د دەستێن نەیارێن وی دا هەبن بدەستخوەڤە هینان، شاهی (دەینل و موکران) و کچا خوە ژی دایێ، بەهرامی فەرمانا وی وەلاتی دا کو ب وەلاتێ فارسان ڤە بهێتە گرێدان. بەهرامی ب کەیفخوەشی زڤڕیڤە و (نرسی) ل گەل چل هزار کەسان رەوانەی وەلاتێن رومێ کر کو ژ شاهێ رومێ بخوازیت باجێ بدەن، بەرەڤ قستەنتینیە ڤە چوو، شاهێ

فیلـــی کـــره قـــۆڕە قـــۆر هاتـــە بـــەهرامـــی ب لاڤـــا
بـــەهرامـــی تیـــرك بـــەردا نـــاڤ بـــەینـــا هـــەر دوو چاڤـــا[(١)]

---

ڕومێ ئاشتی ل گەل کر و هەر تشتێ بەهرامی ڤیای دایێ. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

(١) پشتی کو شاهێن تورك و ڕومێ ب داوی هاتین، ئەو ب خوە بەرەڤ یەمەنێ ڤە چوو ناڤ وەڵاتێن سودانێ و گەلەك ژ سەرکردێن ئەوان کوشتن و هژمارەکا زێدە دیلکرن و زڤڕیڤە وەڵاتێ خوە، پاشی ل داویا دەستهەڵاتداریێ جارەکێ بەر ب نێچیرێ ڤە چوو و بزاڤەکا زێدە ل سەر کوشتنا بزنەکێ کر بەلێ هلنگڤت و کەڤتە بیرەکێ دا و ئەڤ چەندە گەهاندنە دەیکا وی، دەیکا وی بەرەڤ وی جهی ڤە چوو و دەستویر دا وی بینە دەرڤە، گەلەك تەقن ژ بیرێ هینانە دەر هەتا بوو کومەکا هەستیان و ئەو پەیدا نەکر، دەستهەڵاتداریا وی هەژدە ساڵ و دەهـ هەیڤ و بیست ڕۆژ بوون. ((ژ تیبینییێن هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی هاتیە وەرگێڕان)).

## بأسم الله رب الخلائق

بدأت بأسم الله رب الخلائق
أصلي على من كان وجهه كالبدر
عليك سلام الله يا ارشد الرشد
محلا بأنواع اللألي والدر
أخص به معنى الكمال وشخصه
وسباق غايات الفضائل والفخر
وقصدي به ألألمعي الذي به
ينير رسم الدين كالشمس والبدر
فضلت على أهل الفضائل والعلا
بهمتك العلياء والنائل الغمر
كما فضل البدر والمنير على السهى
وطم الخصم المستطيل على النهر
فأنت رشيد عن المهمات كلها
وصور الوغى في الكرب والكر والفر
فأنت لنا فخر وأنت لنا عز
لأبدائك الحق الى أبد الدهر
هو الفاضل الديان فضلا ونائلا
هو الماجد المذكور في الحق بالحد
هو ناصر الاسلام والظهر للهدى
فبورك من صدر وبورك من ظهر

فأخوانـــــك العـــــلام افتخـــــروا بكـــــم

علـــى مـــا بـــدأ مـــنكم مـــن الخيـــر والبـــر

وقفـــــت علـــــى جمعكـــــم بـــــأبى الحـــــلا

وفكـــرت حتـــى كـــدت اغـــرق فـــي الفكـــر

فكنـــــت صـــــريحا فـــــي حـــــوارك عنـــــدما

جمعـــت بضـــرغام جمعـــتم علـــى الخيـــر

لـــــه العـــــزم تنجـــــاب الخطـــــوب لعزمـــــه

كمـــا انجلـــت الظلمـــاء عـــن وضـــح الفجـــر

لقـــــد خلقـــــت كفـــــاه للنـــــاس آيـــــة

فيمنـــاه مـــن يمـــن ويســـرا مـــن يســـر

اذا كـــــان مـــــأمولا فخيـــــر مؤمـــــل

ليســـعد شـــعبي قـــد كفـــاني نـــت الفخـــر

اذا اهـــــتم صـــــدام بســـــعى معجـــــل

فلـــيس عجيبـــا مـــن فضـــائله العـــز

لقـــــد قـــــال ان الكـــــرد اذاقـــــوني الأذى

وأوعـــد رفـــع الحيـــف عـــنهم بـــالخير

ولاتـــــــــــزرو وازرة وزر واحـــــــــــد

بهـــذا يقـــول اللـــه فـــي قولـــه الغـــر

أنـــــا والـــــد المهـــــدي ســـــندي ارومـــــة

بعثـــت لـــك عقـــدا يـــوزن بالـــدر

## أيا منقذ الأكراد

أيـــا منقـــذ الأكـــراد مـــن كـــل ظـــالم
عسـى اللــه أن يرعــاك بــالعز و النصــر[1]
لـــك همـــم مثـــل الجبـــال رفيعـــة[2]
وهمتـــك الأدنـــى تقـــارن بالـــدهر[3]
لـــك كـــف جـــود كـــالبحور ملئيـــة[4]

---

(1) ل جهەكێ ديتر:
يـــا قائـــد أيلـــول العظـــيم ويـــا
مـــن كـــان لحـــال الكـــرد يزدهـــر
حـــررت قومـــك مـــن ظلـــم ومـــن عســـف
بفضـــل فيضـــكم الحـــق ينتشـــر
بأنـــت فضـــائلكم فـــي الكـــرد كلهـــم
فـــالكرد كلهـــم بـــالعز تفتخـــر
منـــت علينـــا أبـــا مســـعد فـــي كـــرم
فأنـــك المـــرء نرجـــوه ونـــدخر
ومـــن ســـحائب كفيـــك اذا هطلـــت
تنـــوب فـــي الجـــدب عـــن مثعجـــر المطـــر
ومـــن اذا رمـــت احصـــاء مناقبـــة
ادى بـــي الأمـــر عـــن عجـــز ال حصـــر

(2) ل جهەكێ ديتر: لك همم لا منتهى لكبارها.

(3) ل جهەكێ ديتر: وهمتك الصغرى أجل من الدهر.

(4) ل جهەكێ ديتر: لك راحة لو أن معشار وجودها.

بأنواع در والجواهر والعطر[1]

فأنت سليمان الزمان لشعبكم

يطيع لك الأكراد بالعز و الفخر

كما كنت موسى لجميع الفراعنة[2]

وفرعون مصر أغرق الله في البحر

ونمرود تكريت يحاول غدرنا

نبيه موشيل هو منشاؤ الكفر

يوجه أفكار العروبة كلها

الى الكفر والألحاد والفسق والجور

وأنت أبا الأكراد ياخير قائد

توجهنا للدين والخير واليسر

فأنت[3] شريف وابن أشرف اسرة

ومنشاءوك البارزان عاصمة الفخر

شأدعوا اله الخلق في كل ليلة

وراء الصلاوات وفي وضح الفجر

وفي كل ظهر بعد كل عبادة

تكون لنا ذخرا الى أبد الدهر

وأعني به قسورة الكرد مصطفى

فيمناه من يمن ويسراه من يسر

رفعت رؤس الكرد بعد تكوسها

فأحييت ميتا كان في اللحد و القبر

---

[1] ل جهەكێ ديتر: على البر كان البر أندى من البحر.

[2] ل جهەكێ ديتر: كما أنت موسى لفراعين يعدب.

[3] ل جهەكێ ديتر: وأنت.

وعــيش بــدوام العــز يــا خيــر قائــد

بــرغم العــد لازلــت فــي الخيــر و اليســر

وكنــت رئــيس الكــرد حقــا بأرضــك

وصــاحب نــور فــي الخلائــق كالبــدر

فضــلت علــى أهــل الرأســة والعــلا

بهمتــك العليــا والنائــل القمــر

فكنــت رئــيس الأســد والأســد حــولكم

فــنم عليــك مــن مهابتــك الغــر

لقــد غبــت عــن قومــك ســنين عديــدة

فيعجــر عــن ايرادهــا الســن النثــر

رجعــت عزيــزا بعــد ان نلــت نكبــة

فأرســيت للأكــراد قاعــدة الفخــر

بــك عــرف الأكــراد فــي كــل بقعــة

ولــولاك كــان الكــرد فــي الــدل و القهــر

ولكــن فضــل اللــه عليــك كثيــرة

لقــد أبــدأ اللــه العســر باليســر

أخــا البركــات المرتجــي دام ظلــه

أخــا الكــرم والجــود فــي اليســر و العســر

هــو الصــدر للأســلام و الظهــر كلهــدى

فبــوك مــن صــدر وبــورك مــن ظهــر

لــك العــز تنجــاب الخطــوب لعزمــك

كمــا اتجابــت الظلمــاء فــي وضــح الفجــر

لقــد خلقــت كفــاك للنــاس آيــة

فيمنــاك مــن يمــن ويســراك مــن يســر

اذا كنـــت مـــأمولا فخيـــر مؤمـــل

ليسـعد شـعبي قـد كفـاني مـن الفخـر

فقـــر عينـــا أبـــا الأكـــراد قاطبـــة

بـــوارث دفـــع الأكـــراد للفخـــر[١]

ونـــم بقبـــرك مرتاحـــا بـــلا كلـــل

صـبت عليـك رحمـات اللـه كـالمطر[٢]

وأنعـــم بجنـــان بـــلا شـــبه

فـي الحسـن و الطيـب لا غـول ولا كـدر

يـاعين وجـودي بـدمع العـين قاطبـة[٣]

علـي زعـيم الـذي للمجـد والفخـر[٤]

علـى جمـال شـباب الكـرد ياضـعة[٥]

ادريســـنا وبـــه الأجيـــال بـــالفخر[٦]

ياخـــالق الكـــون ارحـــم روح قادتنـــا

واشـــربهم قـــدحا مسلســـل الكـــوثر

فعـــوض اللـــه للكـــرد بمـــا جبـــرت

بـــه خســـائرهم مـــن كـــل محتكـــر

واســعد اللــه شــعب الكــرد فــي نعــم

بـــوارث الحكـــم مســـعود و تفتخـــر[٧]

---

(١) ل جهەكێ ديتر: بوارث وبه الأكراد تفتخر.

(٢) ل جهەكێ ديتر: والمطر.

(٣) ل جهەكێ ديتر: هاطلة.

(٤) ل جهەكێ ديتر: ينحدر.

(٥) ل جهەكێ ديتر: قاطبة.

(٦) ل جهەكێ ديتر: تفتخر.

(٧) ل جهەكێ ديتر: بوارث الحكم مسعود أبا الكرم.

# شـەلا دەلال

جارەکێ مەدی شـەلا دەلالێ   دیسا لمە هلدایە ڤـێ
هەژوەکی قەعتاعێ لـ سـەرێ   ئاڤێ کولێک هلدا ئەڤێ

چەند مەنظەرا لێ خەرجیم   هەر کەیفو گوڤەندوە ما
پاشی دخوینی کە بچیم   کافا کولێک هندا ئەڤە

چاخا کو ئەو سـەرگوم دبون   سـەرێ داوو عاقل مێ دچون
دیسا دخوینێ وەرد بوم   ما کا هنا سـەعارە ڤـێ

سـراوێ ئەز ئەبتە دکرم   ذعەنێ حەیاتێ دەر کرم
پێ جام دعەرێ وەر کرم   رۆژا دەلالێ لمن بوشە ڤە

دائم ژ ڤەلمن طاریە   هەردەم گرینو زاریە
ساخێ گوهوبت بوجیە   را بە لمرنێ دا کە ڤێ

من ژین لڤێ عەردی نیە   ژ دینا بێ رەزالەت بو چیە
ئێشو سـوتە م من ژێ دیە   حالێ ئەڤین دارا ئەڤێ

حالێ ئەڤین دارا وە ما   دائم فەقیرو بێ چهە
دل قورمچی هەروە دژهم   هەردەم ژ نیشکێ ئەکە ڤە

چەند عاشقێ پێشی مە بون   پێکڤە هەمی ئەو سوختە بون
عدد ١٨   لدنیا دنێ بەیهودە بون   هەردەم لوان جەورو جەفە

حافظ دگەل رجی ئومەتم   سـەیدا ئەجزاوێ ژ هەمە م
ریکا دورستی وا ئەدیـ   توری دگەل وا هەمە رە ڤـە

# دورا قیمەت گران

لاوانێ

وەردە لاگولا لاوانێ    تو دورێ قیمەت گرانێ
هەکیمێ شوبهێ لقمانێ    من هەرو هەر ئەڤ رە فیق

من هەرو هەر ئەڤ و هەڤالە    شەڤ و روژ دائم لبالە
ئاسکا گەردەن بخالە    رەشێ روحانا بوژ عەمیق



دەشێ روحانا ل بەردەراقا    عەنبەرا ریشێ بلاقە
هەرسە هەر بێژن جوهناقا    قوطیا مسکا رە عەقیق

قوطیا مسکا بفالێ    قەمەرا باغێ جەمالێ
گەر توشە مێ وەرشەمالێ    ئەز عەجێب سوتم حەریق

ئەز عەجێب سوتم ب نارێ    شەڤ و روژ من ئاهو زارێ
راحەتێ نینە جو جارێ    هەروەکی بورقێ بەریق

هەردەما بوژ قاقەدا بو    روژ ژلاشێ من جودا بو
صەد مەدەدهاوار خودا بو    ئەز دخوینێ بوم غەریق

ئەز غەریق بوم لەو دناڤێ    بێ هشم هەردەم و گاڤێ
وێ دەمێ لمن کت سلاڤێ    دێ قەژینت من رە فیق

دێ قەژیم دەت من م جانێ    ماچ بکم لەب لەعلو ئانێ
دانە دور گەردەن بخالێ    ئێرو وی گوتە مە نیق

١٩

## بهه‌شت

كه‌ر دبێژن ئ كو جه‌نه‌ت هه‌ژوه‌كي خانه‌قه‌ يه

جه‌ن مريد و شيخو صوفي دێ‌جنێ هه‌ر بو مه‌ يه

غه‌يري فانه كافرن عالم قه‌وي كه‌سێ نا چيتێ

رێبه‌ر و زانا و مونه‌وه‌ر تاليبان هه‌ر فيشيه        فيشه‌يه

شيخ بلا دائم خريكێ گوشتنو فـقو فـجور

ئێكو پێكو جه‌ر دو تالان سيخوري قه‌يدي نه‌يه     طريقێ

جونكه‌ ئه‌و صاحب طريقا پورش زوان قط نا گرێ

فاسقوبێ دين لێك وان غاذي في الله هه‌ يه

ئه‌و بين جه‌نه‌ت بر هدين نه‌ به‌ زانينو علم

هه‌ر كه‌سێ وه‌ك شافعي بها لێك وان عانه‌ يه

گه‌ر بزانم گو بهه‌شت بو يه‌ طه‌ويل خاناكه‌را

(دوزه‌ها) پيس بو يه‌ ذيندانا مه‌لا و ئه‌فه‌ندي را

ئه‌ز ژ يه‌زدانێ دخوزم بێ حورم تا يه‌ يقه‌مبه‌ را

مێ نه‌ بت وێ جه‌نه‌تا صوفي نشين وه‌ك طه‌ويله‌ يه

ئه‌ز دخوم صونده‌ بيه‌زدانه‌ ئه‌ڤ خيا له‌ بێ بنه

ئه‌ز دزانم مێ چ گوت هرچي مگوتي وه‌ك منه

باڤێ وێ فكر الێك خو جونكي پيسه‌ و چلكنه

غه‌يرێ زانينو علم هر تشتێ بتا بێ فايده‌ يه

كدد
١٨

# امپریالیزم

امپریالیزم بو خوشیارە — ژ بو مللەتا هەر ئەو نەیارە
بو کەسێ جودا ناکت جودارە — لە سەر مللەتانێ هەر سویارە

---

قەطنەبومکنە سوودا تە ژ بتێ — ئەمێ یانتسین ئومێد بەبی بت
خۆریکە هەژدەم خەلکی ژ رێ بت — قە دیتە شەیطانا هەڤالێ کیت

---

سەرێ نەوەوی ئەوێ چنگلێن — سێڤەر و وولات هەمی ژمە بدن
دبن دەستێ وان ئەم بدیکرن — دەخلێ م جانەی ئەو بو خو بدن

---

طوپو دەبابەوان دنەخولی — عەدوێ مە سوتو لەکەد خولی
هەرشان کلوخ وانە بەماڤولی — هەتا قیامەت دێ مەدن ژخولی

---

طەیارە و پاپوڕ و وان دگرکرنێ — بو نیاییا خەڤ طەن و ئەوێ لێ مەدخوین
دلو میلاکا وێ لێ دەدرتین — عەشیر و عیلا وێ لێ مەدبزین

---

ئسطولێ وان ئەو خشنەناڤێ — بوخوبی دکن ئەو سەیدوراڤێ
داچی مگرن روژ هەلاتاڤێ — خولبە ژمە قەدا هەرد و موگاڤێ
(ڤێ)

---

تو ژ ئیپادێ ئەوان چێکرن — بە ملیونا عالەم بەوێ ئەومرن
چی دەرا ڤیا بوخوبێ دکرن — هیژا دبێژن ئەم نەکافرن

---

روسو ئەمریکانو وەکی ئیتطالی — فرەنسا و ئنگلیز دگەل ئەلمانی
هەردەم خەریکن بێ گەلێ فەلک وە چە — دەرا ستبان دەستلێ سەر دانی

---

هیژا دبێژن ئەمێ مروەتین — دگەل شعوبا ئەم بێ عەدالەتین
لەوا دبینین ئەم بێ سەرکەتین — ژبو موحتاجا ئەم بێ دورفەتین

عدد ١٦

٤٢١

بهار خوشە ! سێ گوشە

بهار خوش و چاخێ کێشینە — دبێ مە حفورە نە قشینە
چ تێرخە ملە چەرە نگینە — تێدێ گول شە نگو نسرینە
هەمی گول پێکڤە دەربینە — روێ عەردێ ~~وەکی بهحرێ~~ نە مابە فرە

---

چ خوش وەختە ژ بولاوا — جە حێلو جانو دل داوا
بچن گەشتو بکن راوا — لسەر شاخو لدور ئاوا
ئەگەر بێژی من تە حال چاوا — ژیان من هەر دووکێ قە بدرە

---

سەرحەڕ لگا هاد نالم ئەز — ژ عەشقا سور گولا ژوریێ
ئەدل خوشو نە باشم ئەز — بقێ نرخێ ژیان بوریێ
وەکی بلبل دنالم ئەز — لبەر چاخو هەمی دەورە

گوێشا

---

عەبادل شەڤ گەهادخوێنن — دگەل شالول دلو رێنن
بە خێر و خوشیو ژینن — ژ ئەڤینێ سەرخوشو دینن
ئەوەکی منە ئەو دبورینن — لمن خوارن وەکی ژەهرە

---

حەمێ لگا ڤا بگو ڤانم — بە ئاهو ئوهو گریانم
دبینێ مەستو حەیرانم — ژ بو دلبەر دلو ڤانم
لەغەرلانم بەئامانم — هەمی وەختا لمن جەورە

دفو بینم

---

وەکی قەقنەسێ دخوێنم ئەز — وەکی زەڤا دبینم ئەز
وەکی فورهاد نهیم ئەز — وەکی فەرخێ ژچەرینم ئەز
وەکی مەجنون دمینم ئەز — تێرێ ل و جولا ددم دەورە

---

١٨

به‌یتا صه‌دما للا نونی! أی نورالدین! قصیدة النونیة الملاویة

| | | |
|---|---|---|
| ئه‌ی نونو واوو رئو ئا | وه‌ی لامو دالو یائو نون | |
| رابه‌ ژبو خو کارکه | بێشول تو ئێدی به‌تابدتو نا | |
| | رابه‌ ژخه‌و هشیاری به | هه‌ردەم ب گریو زاری به |
| | به‌سێ تولین ڤی یاری به | هاوریو هاو کارلێته‌چون |
| یه‌ک یه‌ک ژته‌ بوئه‌جود | موحتاجی بو رینا خو دا | [illegible] |
| که‌سکێ جو فایده‌ ل وان نه‌دا | هه‌رووه‌کی ئه‌و دوستێ ته‌ بون | |
| | هه‌رووه‌کی که‌سێ ژلوفه‌قیر | که‌سێ وان جوجا نائێته‌ بییر |
| | جونو دیار نابن لدیار | ژبیا ئه‌وان بی‌ هوده‌ بون |
| ژ دنیا عه‌مه‌ل دگه‌ل نه‌بیت | لێ رێ خودان به‌رگه‌ندبیت | |
| بێ شک که‌دی بێ چاره‌ بیت | پێتش به‌رخودائێ سه‌رنخون | |
| | ڤێجا دڤێت هشیار ببێ | بوطاعه‌تێ توب کار ببێ |
| | لنه‌فسا خو تونه‌یار ببێ | ڤاپێنجی ژ عومرێ ته‌چون |
| پێنجی لته‌ بورین ته‌مام | هه‌رغافلێ ئه‌ی بێ مه‌قام | |
| بو نادێ توبه‌ رده‌وام | ڤێ پیره‌ پیساحیه بون | |
| [illegible] | دونیا که‌ ئه‌ڤ پیرووگه ڤن | لاوێ به‌عاقل ژێ ته‌ره‌ ڤن |
| | هیچ ئه‌و لدورێ نامه‌ ڤن | دزانن چ پیسه‌ وکه‌ ڤنه‌ قون |
| دزانن چ ئه‌و بێ تالییه | ژراستو درستێ خالییه | |
| بێ شک که‌ هه‌ر ئه‌و فانییه | دزانن ڤه‌وێ لپێشا هون | |
| | دزانن قوی ژجون گه‌له‌کێ | جانوجه‌حێلو جاق به‌له‌کێ |
| | پێ کفته‌ دگورێ بون گه‌له‌ک | لێ طاری بو دونیا ڤه‌روون |
| دونیا لوان طاری ڤه‌بو | هاورێ ژبو وان قه‌طه‌ بو | [illegible] |
| بته‌نها لگوری سوخته‌ بو | بودبون ژئاخ وان عویبون | |
| | ئه‌و بێ هه‌ڤالو هه‌ده‌رن | به‌سێ وان عه‌مه‌ل بوهه‌ ڤه‌رن |
| | دیلن لدوستێ ده‌ ڤته‌ رن | کاوان عه‌مه‌ل تێدا هه‌بون |
| رابه‌ ژتو ژدنی [illegible] بکه | بو ئاخره‌تێ توب چار بکه | |
| هه‌رن گوهات باش بار بکه | بیژه‌ فلیحیا العاملون | |

مالا پەندا — بيت النصيحة

خودێ قورئان هنارتە بو محمد — کو قانونە ژ بو دونیا و دینی
هەمی ئەحکامو ئادابێن وێ بەیانن — نەکو تشتەک ژ ئەحکاما نهێنی
چ تشتێ گوتی پێکڤە بو مرۆ راستە — دزانم ئەز ئەڤ تعلیم و الیقینی
ئەگەر باوەر نەکی ئەڤ گوتنا من — یقین تو کافرەک زوری لەعینی

١ خودێ تێدا بەیان کر بو مە هەر تشت — لسەر مە فەرزن کرن پێنج رکنێ دینی ٢
ژ ئەول شەهدە یە ئێدی نڤێژن — زوان جێدبێت خوشی و پاکو بژێنی
زەکاتو روژیو حەججا مە راستە دی — سپاژدارین ژ یەزدان بو ڤی دینی
٢ هەبین شەش رکنێ ئیمانێ بزانە — فەرل سەرتە بوون باوەرشینی

٣ بکێ باوەر بە یەزدانو مەلاکان — بکتێبو پێشو رەوا و رۆژا نهێنی
چ خێرو شەر رهەمی ئدە ستێ خودێنە — دڤێ شادمانی بی و بێ سەرهلێنی
هەچی تشتی گوناه لازم نەکی تو — ئەگەر راستە مروڤەک توبە دینی
زەکاتێ خێرا توبدە بو هەژارا — گەلەک باشە ئدێ وان توبنهێنی

ئەگەر خێرو زکاتا تو نەدی وان — خودێ بکم تو جو خێرێ ژێ نەبینی
٤ دگەل جیرانا زور باشونەرم بە — کو ئەڤ رمانا هوەسا کریە بو مە دینی
خودێ گو جارێ قوربێ تو ل طرنشتێ — دڤێت رو خوشی تو صرده ٢ وی ببینی
دزی و کوشتن زنا زور پیسونە حێن — بڤانەل هەردو مالا سەرجەهینی ٥

---

١- اشارة الى قوله تعالى ما فرطنا في الكتاب من شيء

٣- اشارة الى اركان الايمان الستة وهي امنت بالله وملائكته وكتبه ورسله وباليوم الاخر وبقدر الخير والشر :—

٤- اشارة الى قوله تعالى والجار القربى والجار الجنب والصاحب بالجنب

٢ إشارة الى قول الرسول بني الاسلام على خمس شهادة ان لا اله الا الله وان محمد رسول الله واقام الصلاة وايتاء الزكاة وصوم رمضان وحج البيت

٥ : قال تعالى والسارق والسارقة فاقطعوا ايديهما الخ وقال تعالى ولا تقربوا الزنا انه كان فاحشة وساء سبيلا !

١ خه‌لیفێ ئه‌وه‌لی بوبه‌کرێ شیخه — لأشکفتێ هه‌ڤال بو بوئه‌مینی
دووەم فاروقه صیح که‌سێ وه‌ک وێ نابن — ئه‌گه‌ر باوه‌ر نه‌کێ میژو بخوینی
سیه‌م عثمانێ باشێ رموحه‌یایه — ئه‌وێ مالێ د... هو رفکرێ بو ڤه‌دینی
٢ علی المرتضی چارێ ته‌مامێ — ئه‌وه ده‌رگه‌هێ بو باجێرێ دینی

٣ ئه‌مرێ موجبته هه‌د پیکفه ده‌لالێ — که له گێ زه‌حمه‌تا ئه‌وان بدبوڤێ دینی
به‌یا غوتوخێ شه‌رعی بدنه‌گه‌ردوون — به‌یان کر بومه‌کشی تشتێ نه‌هینی
٤ مه‌لایێ باشێ لشونا ئه‌نبیا نه — ئه‌گه‌ر باوه‌ر نه‌کێ ابلیسی جم بینی
خوده‌ی لێ وان خوش ببت پیکفه هه‌روه‌ر — بهه‌شت جه بن لدوێ ئاخه‌ره‌تی

ئه‌یارێ ژگه‌ل مه‌لاو دینێ خرابه — ئه‌گه‌ر توبکێ یه‌قین دێ خو خه‌دینی
٥ خودێ خوش بو لأنصارو موهاجر — ئه‌گه‌ر فه‌کرێ تو دێ لێ قرآنێ بینی
٦ هه‌تالێ ئه‌حمه‌دێ پیکفه عه‌زیزن — لسه‌ر قولێ وان ملندی بو رجا دینی
توقه درو ئیحترام بکره بو وان — ئه‌گه‌ر ئه‌وگه‌ره‌کێ ماکه‌ر چیدینی

---

١ اشارة الى قول الله عز وجل (ثاني اثنين اذ هما في الغار اذ يقول لصاحبه لا تحزن ان الله معنا) !—

٢ اشارة الى قول الرسول ص انا مدينة العلم وعلى بابها !— وقال اعلمكم على

٣ اشارة الى قول الرسول ص لا يجتمع على امتي على ضلال !—

٤ اشارة الى قول الرسول (ص) العلماء ورثة الأنبياء وقال رسول الله (ص) علماء امتي أفضل من انبياء بني اسرائيل !—

٥ اشارة الى قوله تعالى (لقد رضي الله عن المهاجر والأنصار

٦ اشارة الى قول الرسول (ص) لو يجمع اهل الدنيا كلهم لم يبلغوا نصف اصحابي ولا ثلثهم ولا مدهم !—

٢١

ژنێ بسینه بدادو لاوری بی‌یار[1]
ئه‌مام كه تو به وێ ئادابێ دینی

1 – به‌لێ ئیكا به‌دینو باش تو بسینه
به یادكر بو مه بێ ڤی وه‌نگلی ئه‌حسینی

هه‌ركه شوڤ باشو سولێ وێ ئه‌م لادبێ
تو دێ به‌ رخوده‌كی باش ژنێ هه‌لبینی

2 – به‌رێ خو تو نه‌ده ناموساخه لكی
دگه‌ل ژنكا بێ تێ نه تو قه‌ط نه روینی

نه جاڤ نیڕێ ده‌رێ خه‌لكێ به‌ ئه‌رمه
دڤیتن تو ئه‌ڤانه به ئه‌ندا[1] هه‌لینی

گو هو ینگو ژنێ ئه ڤێت ستاربی
نه هێله وه‌ رگرن به‌ ره‌گێ جوهینی

تو بگره دینو ناموسا بو ئه‌مامی
ئه‌گه‌ر نه باشی تو دوژه نشینی

ئه‌ده‌ب ده تو بچوكێ خو ژ ئه‌وه‌ل
شڤگك ئه‌ ژبیت تو دێ شتێ بلنی چه‌هینی

مه‌ظن بو نه ئه‌وبه چو هه‌ر ژ ئه‌ شیوان
وه‌كی دارێ هشكێ دێ وێ قدینی

و یاخو دێ ته ده‌ركن ئه‌و ژ مالێ
و یادێ و ان ژ هێلینێ فدینی

ئه‌گه‌ر گوه تو نه‌دێ من ئه‌ڤێ بدەر
تو دێ ژ قه‌هرا ژ كێ خو زودرینی

گێ ئه‌ هاته شیوێ زو بده جهو ده
بده سه‌ر ئیكێ داخێزێ ببی نی

ئه‌گه‌ر تو وی نه دێ شیوێ شه‌رم بوته
به پوشمانی سه‌ر ئه دێ تو نه ژی نی

نه به‌ها قال دگه‌ل قورتی جوهارا
ئه‌گه‌ر نه دێ هیلاكێ ل خو حه‌مینی

مه قالێد گه‌ل قرێ هه ژنكێ بیسه
بدا بوچی دگه‌ل وێ دوقرینی

---

1. اشارة الى قول الرسول (ص) تنكح المرأة لأربع خصال لمالها وجمالها وحسبها ودينها فاظفر بذات الدين تربت يداك كانه قال هلا بكراً تلاعبها وتلاعبك

2: قال النبي (ص) ويحرم الخلاء مع الأجنبية وما اجتمع رجل وامرأة الا والشيطان ثالثهما!–

# ناڤەرۆك



## پشکا ئێکێ

## هەلبەستێن ئایینی



Zakho Centre for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

